• ناوی کتێب: نزای سەحەر.
• نووسین و ئامادەکردنی: هێمن محەمەد عەلی.
• وێنەی بەرگ: قەیدار ڕەحیم.
• دیزاین: ڕێباز.
• تایپ: زەینەب عەبدوڵڵا ڕەسووڵ.
• چاپ: دووەم و زیادکراو.
• تیراژ: ١٠٠٠ دانە.
• ژمارەی سپاردن: ٢٠٨٨ی ساڵی ٢٠٠٩.



بۆ دەستکەوتنی ئەم بەرهەمە بە (کۆ)
پەیوەندی بەم ژمارە مۆبایلەوە بکە (٠٧٧٠١٥٩٨٣٩١)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ كَانُوا قَلِيلًا مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ (١٧) وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ (١٨) ﴾ الذاريات.

قال رسول الله ﷺ

(أَيُّها النّاس أَفشُوا السَّلام، وأَطعِمُوا الطَّعام، وَصِلُوا الأَرحام، وَصَلّوا بِاللَّيلِ وَالنَّاسُ نِيام، تَدخُلوا الجَنَّة بِسَلام ).

رواه أحمد ٢٣٢٧٢ والترمذي ٢٤٨٥ وابن ماجة ١٣٣٤

قال الشاعر

قلت لليل هل بجوفك سـر
عـامـر بـالحـديث والأسـرار
قال: لم ألق في حياتي حديثاً
كحديث الأحبـاب في الأسحـار

# پێشەکی

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحمدلله رب العالمين، والصلاة والسلام على أشرف المرسلين وعلى آله وأصحابه ومن آتبعهم بإحسان إلى يوم الدين..

﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾﴾ النساء.

نوێـژ: میعراجـی موسـڵمانانە، خـوان و خۆراکی ڕۆحــە، گەورەترین پەیوەندی بەندەی ئیمانداره بە خودای گەورەوە..

نوێـژ: ملکەچی و فەرمـان بەردارییە، تازەکردنــەوەی عەهدو پەیمانە، دەمــە زەرد کردنەوەی بـاوەڕی مرۆڤەکانە، نـزاو پاڕانەوەیە، هۆی بینینی خودای گەورەشە لەبەهەشتدا، بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودای گەورەیە، پەیوەسـت بوونی لاشـەو گیـان و دەروونــە لە یەك کاتـدا بەخـوداوە، هۆی ڕزگاربوونــە لــە دۆزەخ و دوورکەوتنەوەیــە لــە تـاوان و خراپــەو گوناهــ، دروستکردنی پەیوەندی برایەتیە، لەنێوان نوێژ خوێناندا، هۆی یەکناسین و خۆشەوسـتی و تەبایـی و یەکڕیزیە، مایــەی ئارامــی و بەختەوەرییە، چاو گــەش و ڕووناك دەکاتــەوە، ئاو پرژێنــی دڵ و دەروون دەکات.. بە نوێژ کردن ئیماندار هەست بە حەوانەوەو ئارامی و گەشانەوە دەکات..

بـۆ زیاتر تێگەیشـتن لە ڕۆحــی نوێژو گەورەیــی و پلەو پایــەی نوێژ، ئــەم نامیلکەیەی برای بەڕێزم (کاك هێمن محمد شـێخانی) بە ناوی (نزای سەحەر) کە بە ووردی باس لە گرنگی نوێژو چێژو گەورەیی نوێژو نوێژی بە کۆمەڵ، بەتایبەت نوێژی بەیانی و خەوتنانی تێدا کردووە..

زۆر جێگەی دەسـت خۆشـی و دوعای خێرە، کە کاکە هێمن توانیویەتی لە و تەمەنە لاویەی خۆیدا هەست بەو ئەرکە گەورەیە بکات و خامەی بخاتە کار و خۆی تیادا ماندوو بکات..

ئەوەی نووسـیوویەتی لە دوو توێی ئەم نامیلکەیەدا ، شـتێکی پوخت و جوانە و جێگەی سوودە بۆ گشت موسڵمانێك..

هیـوادارم خامـەی هـەر ڕەنگین و بە بڕشـت بێت، تەمەنـی درێژ و پڕ بەرەکـەت و سـەرکەوتوو بێـت و زیاتـر بتوانێـت لەسـەر هەمـوو چەمکە ئیمانیەکان بەو شێوەیە بنووسێت..

والسلام علیکم ورحمة الله

مەلا ئەحمەدی شافیعی

١٥/شعبان/١٤٢٩

٢٠٠٨/٠٨/١٦

# سەرەتا

بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

سوپاس و ستایش بۆ خودای خاوەن دەسەلات و لێبوردە، دروودو سلاو بۆسەر گیانی پێغەمبەری هەلبژێردراو، هەروەها سلاو بۆگیانی هاوەلان و شوێن کەوتوانی تا رۆژی دوایی..پاشان، سلاوی خوداتان لێبێت..

ئەمە چپەیەکە لەدلێکی غەمبارەوە، وەستانێکی پڕلە گلەیی و نالەیە، فرمێسکی ئارەزوومەندانی بەهەشتە، وەستان و رامانێکە لەگەل حالی هەندێ لەموسلمانان...!

چپەیەکە باسی فەرزێك لە گرنگترین فەرزەکانی ئەم دینە دەکەین..

بەلێ.. قسە لەبارەی فەرزێکەوە دەکەین کە کۆتا فەرزە لە سەر زەویدا نامێنێت و یەکەم فەرزیشە کە لە رۆژی دواییدا لەسەری لێپرسینەوەت لەگەل دەکرێت..

❋ فەرزێکە ئەگەر لەجێگەی خۆیداو بەجوانی ئەنجام بدرێت، ئەوا هەمووکردەوەکان سوودمەندو باش دەبن، خۆ ئەگەر تێکچوو، ئەوا هەمووکردەوەکان بێ سوود و خراپ دەبن، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (أولُ مايُحاسَبُ بـه العَبدُ يَومَ القيامَـة، الصلاة، فإن صَلُحَت صَلُحَ سـائِرَ عَمَلِه، وإن فَسَدَت فَسَدَ سائِرُ عَمَله)[١]..

❋ فەرزێکە، هەرکەس بە خشوع و لەخواترسانەوە جێبەجێی بکات، سەربەرز و رووسوور دەبێت..

❋ فەرزێکە: پەیوەندی بەندە لەگەل خودا بەیەك دەگەیەنێت..

❋ فەرزێکە: رێگری دەکات لە هەموو کارێکی خراپ و نارێك..

❋ فەرزێکە: لەلای خودا سکالاو شکات دەکات، بەرامبەر بەو کەسانەی پشت گوێیان خستووەو وازیان لێ هێناوە..

---

١-سلسلة احاديث الصحيحة للألباني رقم ١٣٥٨.

❋ ئـەو فەرزە(نوێـژە)، دوا فەرزبـوو کـە پێغەمبـەری خـودا ﷺ لەکۆتا ساتەکانی تەمەنیدا بیری خستینەوەو ئاگاداری موسڵمانانی کردەوە کەبەچاکی ئەنجامی بدەن..

❋ چپەیەکە ئاراستەی هەموو ئەو کەسانەی دەکەین کەبەنیازی بەهەشتن، خۆ ئەگەر کاریشیان بۆ نەکردبێ و هەوڵیان بۆ نەدابێت، ئەوا ئاراستەی هەموو ئەو کەسانەی دەکەین کە وتوویانە: (أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أن محمداً رسول الله)..

❋ ئێمـە لێرەدا پێویسـت بوو باسـی شـەونوێژ بکەیـن، باسـی بێداربونی پێش بانگی بەیانی بکەین.. باسـی ئەنجامدانی نوێژی بەیانی، نیشانەی لاوازی ئیمانمانە، لەسـەرەتادا لەناو ڕیزی موسـڵماناندا کەسـێك نەبووە نوێژی بەیانی ئەنجـام نەدات، مەگەر دووڕوو(منافق) بووبێت پەنا بەخودا، یاخود لەژیانیدا تەنها جارێك یان دوو جار، ئەویش بەهۆی نەخۆشیەوە، یاخود بەهۆی خەبەر نەبوونەوەیەك، کەدەسەڵاتی خۆی تێدا نەبووبێت..

❋ براو خوشـکی موسـوڵمان: لەو کەسـانە مەبە، کاتێك فریشتەکانی شەو لەدوای نوێژی بەیانی بەرز دەبنەوە بۆ ئاسـمان، خودای گەورە هەرچەندە زاناو ئاگادارە، بەڵام لێیان دەپرسـێت: ئەوە بۆ لە لیسـتی ناوەکاندا ناوی فلانە کەسی تێدا نیە؟!

ئەوانیـش وەڵام دەدەنـەوەو دەڵێـن: فلانەکەس لەنوێـژی بەیانیدا لەڕیزی موسڵماناندا ئامادە نەبوو، یاخود نوێژی بەیانی ئەنجام نەدا..

❋ خوێنـەری بەڕێـز، خوشـك و برای ئازیـز: کاتێك دنیـا تاریکەو خەڵکی دەسـت لەملی خەوو جێگەی نەرمـن، کاتێك دنیا کش ومات و ئارامە، کەسـانێك زۆر بەهێمنی و لەسـەرخۆیی، دەرگای ماڵەکانیان دەکەنەوەو بەرەو ئاراسـتەی بانگی (الله أکبر) و ڕوو بـەڕووی ماڵەکانی خودا هەنگاو دەنێن، دنیا ئەوەندە بێ دەنگە ئەگەر گوێ ڕابگری دەنگی هەنگاوەکانیان دەبیستی، تائەو کاتەی دەگەنە مزگەوت و دڵیان دەسرەوێ..

❋ براو خوشکی بەڕێز: هیوادارم ئەم نامیلکەیەی بەردەستتان تەنها بەچـاو سـەیری نەکەن، بەڵکو دەرگای دڵتانی بۆبکەنـەوە، چونکە ئەم وتانە لە دڵەوە

دەردەچێت و ئاواتەخوازم بگات بە دڵەکان، چونکە بێگومان قسەی ڕۆح بۆ ڕۆحەکان دەگەوێتە ڕێ و دڵەکان بەئاسانی وەری دەگرن، بەهیوای سوود بینین بۆ هەموولایەك ان شاء الله..

## وەستانی ڕۆژی دوایی

ئەو وەستانەی خودای گەورە وەسفی دەکات و دەفەرموێت:﴿ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ ﴿٢﴾ ﴾الحج. واتە: (کاتێك کەڕۆژی قیامەت دەبینن، هەموو شیر دەرێك لەشیر خۆرەکەی بێ ئاگا دەبێت و فەرامۆشی دەکات، هەموو سك پڕو دوو گیانێکیش کۆرپەی لەبار دەچێت و دای دەنێت، خەڵکی دەبینیت وەکو سەرخۆش وان، بەڵام لەڕاستیدا سەرخۆش نین، بەڵکو سزای خوایی زۆر سەخت و سامناکەو سەری لێشێواندون)..

ئەو وەستانەی ڕۆڵە یادی باوکی ناکات، برا برای لەیاد نامێنێ و کچ دایکی لەبیر دەکات، خوشك بیری خوشکی نامێنی و هەمووکەس هاواری نەفسی خۆی دەکات، ئەو وەستانەی پێغەمبەر ﷺ لەبارەیەوە دەفەرموێت: (تدنى الشمس يوم القيامة من الخلق حتى تكون منهم كمقدار ميل)[٢]. واتە: (لەڕۆژی دواییدا خۆر لە بەندەو دروستکراوەکانی خودا نزیك دەبێتەوە، تاوەکو بەئەندازەی میلێکی دەمێنێ بگاتە سەریان).. ئەو کەسەی ئەم فەرموودەیە دەگێڕێتەوە دەفەرموێت: سوێند بەخودا نازانم مەبەست لە وشەی (میل) ئەو میلەیە کە زەوی پێ دەپێورێت، یان ئەو میلەیە کەچاوی پێ دەرێژن..

✵ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: ((لەڕۆژی قیامەتدا هەرکەسەو بەگوێرەی کردەوەکانی لەناو ئارەقی خۆیدایە، هەندێ کەس هەتا ڕەقێنەی قاچیان و هەندێك تا ئەژنۆیان، هەندێکی تریان تاوەکو ناو قەدیان لەئارەق دایە، هەشیانە ئارەق دەگاتە چەناگەیان)).. هەروەها خەڵکی دەبینیت سەر ڕووت و پێپەتی و

---

٢-رواه مسلم.

بێ جل و بەرگ، عەورەتیان بەبێ پۆشاکەو کەسیش بۆکەس ناڕوانێت! ئەزانن بۆ؟! لەبەرئەوەی هەموو خەڵکی سەرگەرمی عەیب و عاری خۆیانن، لەو شوێنە ترسناکەی کەدڵەکان دێنە ناو قوڕگی خاوەنەکانیان و پیش دەخۆنەوە، هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الْآزِفَةِ إِذِ الْقُلُوبُ لَدَى الْحَنَاجِرِ كَاظِمِينَ مَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ حَمِيمٍ وَلَا شَفِيعٍ يُطَاعُ (١٨) ﴾ غافر. واتە: (کاتێك کەدڵەکان دەگەنە گەروو، غەم و پەژارەو تەنگانە دڵ و دەروونی خوا نەناسان بەتەواوی داگیر دەکات، ستەمکاران هیچ دڵسۆزو پشتیوانێکیان نیە،کەسیش تکاکارو خەم خۆریان نیە، تاقسەو تکایان لێ وەربگیرێت)..

پەنا بەخودا لە ناڕەحەتی و ناخۆشی ئەو ڕۆژە!پەنا بە خودا لەقورسی و گرانی و ترسناکی ئەو وەستانە !!

يَومُ القيامةِ لوعَلمتَ بهَولهِ لَفرَرتَ من أهلٍ وَمن أوطانِ
يومُ تَشَقَقَت السماءُ لِهَولهِ وَتَشيبُ فيه مَفارقُ الولدانِ
يَومُ عَبُوسُ قمطرير شره في الخَلقِ منتشر عظيم الشأنِ

ئەگەر ترس و ناڕەحەتی ڕۆژی قیامەتت دەزانی، لەدەست خزم و کەس و کارو نیشتمان و خاك و وڵات ڕات دەکردو بەرەو شاخ و کێوەکان هەڵدەهاتیت، چونکە لەو ڕۆژەدا، ئاسمانەکان پارچە پارچە دەبن و کۆرپەکان قژی سەریان سپی دەبێ، ئەوڕۆژە ناوچاو تاڵەی کە ناڕەحەتیەکەی زۆربەی خەڵکی دەگرێتەوە..

بەڵام لەو ڕۆژەدا هەندێك کەس دڵنیاو ئارام و بێباکن، دوورن لەگەرمی و ناڕەحەتی.. ئایا دەزانی ئەو کەسانە کێن؟ ئەوە ئەو کەسانەن کە لەژێر سێبەری خودای گەورەدا ئارامیان گرتووە، کەلەو ڕۆژەدا هیچ سێبەرێك نیە، تەنها سێبەری خودای گەورە نەبێت، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (سَبعَةُ يُظِلُّهُمُ اللهُ فِي ظِلِّهِ، يَومَ لا ظِلَّ إلا ظِلُّهُ). واتە: (حەوت کۆمەڵ لەژێر سێبەری خوادان، لەڕۆژێکدا کە هیچ سێبەرێك نیە، جگە لەسێبەری خودا.. لێرەدا باسی یەکێك لەو حەوت کۆمەڵە دەکەین ئەویش (رَجُلُ قَلبُهُ مُعَلقُ بِا لمَساجِد)[٣]. ئەمانەش ئەو پیاوانەن کە دڵیان پابەندو وابەستەیە بە مزگەوتەکانەوە).. بەڵێ.. مزگەوت

---

٣-رواه البخاري ومسلم.

قوتابخانەی پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵانیەتی.. ئەم فەرموودەیە باسی ئەو کەسانە دەکات، کاتێـك کە لە مزگەوت دەردەچن دڵیان لای ئەوکاتەیە کە دەگەڕێنەوە بۆ مزگـەوت، دڵیان لای نوێژەکانیانە، ئەو نوێژەی کە میعراجی ئیماندارانەو دڵیان بۆلای پەروەردگار بەرز دەکاتەوە..

❖ عائیشـە دایکـی ئیمانـداران (خـودای لـێ ڕازی بێـت) دەفەرمووێـت: (لەگـەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ قسـەمان دەکردو ئەویش قسـەی لەگەڵ دەکردین، بەڵام کاتێك کاتی نوێژ دەهات، وەکو ئەوە وابوو نەبمان ناسێت و نەبیناسین)..

ئەو نوێژەی جارێك نەبوو لەکاتی (الله اکبر) ی نوێژ دابەستندا ناڵەی گریانی لێ بەرز نەبێتەوەو هۆن هۆن فرمێسـك بەچاوەکانیدا نەیەتە خوارەوە، چونکە دڵنیایە هەروەك چۆن لەنوێژەکانیدا ڕووبەڕووی خودا وەستاوە، ئاواش لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵ خودای گەورەدا گفتوگۆ دەکات و لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت..

❖ عبـدالله ی کـوڕی شـەخیر دەفەرموێت: (اتیت رسـول الله ﷺ وهو یصلي ولجوفـه ازیز کأزیز المرجـل في البکاء)[٤]. واتە: (چووم بـۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ نوێژی دەکرد، دەگریاو کزە لە سنگیەوە دەهات،وەك کزەو کسپەی مەنجەڵی سەر ئاگر )..

❖ لە یەکێك لە غەزاکاندا پێغەمبەری خودا ﷺ، (عوببادی کوڕی بیشـر)و (عەممـاری کوڕی یاسر)ی دانا بە پاسەوان.. ئەم دوو هاوەڵەش ڕێککەوتن لە سەر ئەوەی سـەرەتا (عەممار) پاسەوانی بکات و لە نیوەی شەویش بە دواوە (عوبباد) پاسەوان بێت.. کاتێك سەرەی (عوبباد) هات و هەستی بە ئارامی شەو کرد، ڕووی کردە خوداپەرسـتی و دەستی بە شـەونوێژ کرد، لە نوێژەکەشـدا دەستی کرد بە خوێندنی سـورەتی (الکهـف).. یەکێك لە بێباوەڕان تیـرو کەوانەکەی دەرهێناو تیرێکی لە (عوبباد) گرت، (عوبباد) تیرەکەی لە جەسـتەی دەرهێناو لە قورئان خوێندن و نوێژ کردن بەردەوام بوو.. کابرای بێباوەڕ تیرێکی تری گرتە (عوبباد)، (عوبباد) ئەم تیرەشـی لە جەسـتەی دەرهێنـاو هیچ باکی نەبـوو.. بێباوەڕەکە تیری سـێیەمی ئاڕاسـتەی (عوبباد) کرد، (عوبباد) ئەم تیرەشـی لە جەسـتەی

---

٤-رواه أبوداود /٩٠٤.

دەرهێناو بە (عەممار) ی وت: هەستە (عەممار) بریندار بووم.. کابرای بێباوەڕ کاتێك هەردووکیانی بینی هەڵهات.. (عەممار) گلەیی لە (عوبباد) کردو پێی وت: بۆ لە سەرەتاوە خەبەرت نەکردمەوە؟! (عوبباد) یش لە وەڵامدا وتی: نوێژم دەکردو لە نوێژەکەشمدا سورەتی (الکهف) م دەخوێند، پێم خۆش نەبوو قورئان خوێندنەکەم ببڕمو حەزم دەکرد سورەتەکە تەواو بکەم، سوێند بە خودا لەبەر فەرمانەکەی پێغەمبەری خودا ﷺ نەبووایەو لەوەش نەترسامایە کە زیان بە پێغەمبەرو هاوەڵانی دەکەوێت، مردنی خۆمم پێخۆشتر بوو، لەوەی نوێژەکەمو خوێندنی ئەو سورەتە پیرۆزە ببڕم..

❖ حاتەمی ئەصەم دەفەرموێت: کاتێك هەڵدەستم بۆ نوێژو ڕادەوەستم، کەعبە دەخەمە نێوان برۆکانمەوەو بەهەشت دەخەمە لای ڕاستمو دۆزەخ لای چەپم، واشدەزانم فریشتەی ڕۆح کێشان لە دوامەوەیەو لە سەر پردی (صراط) یشم، وا گومانیش دەبەم کۆتا نوێژم بێت، پاشان نوێژەکەم دەست پێدەکەمو ناشزانم خودا لێم وەردەگرێت یان نا..

❖ ئیبن سیرین دەفەرموێت: کاتێك موسلیمی کوڕی یەسارم بینی، سەری لە سوجدە بەرز کردەوە، سەیری شوێنی سوجدەکەیم کرد، لەبەر فرمێسك وەکو ئەوە وابوو، ئاوی لێڕژا بێت..

بەڵێ.. ئەسرین ڕوومەتەکانی تەڕ دەکاتو ڕوخساری دەگەشێتەوەو ڕووناکی دایدەگرێت، کاتێك دەیەوێت بخەوێت، خەوی لێ ناکەوێت، لەترسی دۆزەخو لە خۆشی بەهەشت..

❖ عەلی کوڕی حسێن (خودا لێیان ڕازی بێت) کاتێك دەست نوێژی دەگرت دەلەرزی و ئارەقی دەکردو ڕەنگی تێکدەچوو، پرسیاریان لێدەکردو لێیان دەپرسی بۆچی وات لێ بەسەر دێت؟ ئەویش دەیفەرموو: ئایا دەزانن کەمێکی تر لە خزمەت کێدا ڕادەوەستم؟!

❖ کاتێك پرسیار لە خەلەفی کوڕی ئەیوب دەکرێتو پێی دەڵێن: چۆن دەتوانیت ئارام بگریت لە کاتی نوێژداو مێش لە خۆت دوور ناخەیتەوە بۆ ئەوەی نوێژەکەت لێ تێکنەچێت؟ ئەویش لە وەڵامدا دەفەرموێت: کەسانێکی لە

ڕێ دەرچووو لـە ژێر قامچی فەرمانڕەوەكانیاندا ئارامیان دەگرت و پێشبڕكێیان دەكرد و شانازییان بە خۆیانەوە دەكرد، بۆ ئەوەی پێیان بڵێن فلانە كەس بەهێز و ئارامگرە، ئەی من چۆن لە خزمەتی خودای گەورەدا ڕابوەستم و مێشێك بتوانێت بمجوڵێنێ و نوێژەكەم لێ تێك بدات؟!

❖ ئیمامی بوخاری (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) شەوێكیان نوێژی دەكرد حەڤدە جار زەردەواڵـە پێوەیدا، لە دوای تەواو بوونی نوێژەكـەی فەرمووی: بزانن ئەوە چی بوو ئازاریدام؟!

❖ موسلیمی كوڕی یەسار لە مزگەوت نوێژی دەكرد و بەشێك لە مزگەوتەكە داڕوخا، خەڵكانی نزیك مزگەوتەكە ترسان و ئەمیش هەر ئاوڕیشی نەدایەوە..

❖ كثیری حیمصي شەسـت سـاڵ پێشـنوێژی شـاری حیمص بوو لە سـوریا، لـەو ماوەیەدا تەنهـا جارێك نوێـژی لێ تێكنەچوو،پرسـیاریان لێكـرد كە چۆن لەم ماوەی شەسـت سـاڵەدا نوێژت لێ تێكنەچووە؟! لە وەڵامـدا وتی: هەر كاتێك لـە دەرگای مزگەوت هاتبێتمـە ژوورەوە جگەلە یادی خودا هیچ شـتێكی ترم لە دەرونمدا نەهێشتووەتەوە..

❖ خێزانـی عومەری كوڕی عبدالعزیز دەفەرمووێت: كەسـم نەبینیوە وەكو عومەری هاوسەرم لە ڕۆژی دوایی بترسێت و لە نوێژدا ئەوەندە بگریت، تەنانەت ئەوەندە دەگریا، جاری وا هەبوو گومانم وابوو كە مردووە.

❖ ڕۆژێـك پێغەمبەری خـودا ﷺ لە پێش نوێژیدا ئـەم ئایەتە پیرۆزانەی دەخوێند: ﴿ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٣﴾ لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَابٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ ﴿٤٤﴾ ﴾الحجر. واتـە: (بێگومان دۆزەخ بەڵێنگای هەموو ئەوانە بە گشـتی * حـەوت دەروازەی گەورەی هەیە، هەر دەروازەیەكیشـی چەنـد دەرگاو چەند بەشێكە، كە دەستەی دۆزەخیەكان بە گوێرەی گوناهـ و تاوانیان ڕاپێچ دەكرێن بۆ ناوی).. لەم كاتەدا سەلمانی فارسی ﷺ گوێی لێدەبێت و ماوەی سێ ڕۆژ هەڵدێت بۆ دەرەوەی شاری مەدینە و ئاگای لە خۆی نامێنێت، پاشان هاوەڵان دەیدۆزنەوەو دەیهێننەوە بۆ لای پێغەمبەری خودا ﷺ.. سەلمانی فارسی ﷺ فەرمووی: ئەی پێغەمبـەری خـودا ﷺ كاتێك لـەو ئایەتە پیرۆزانە ورد بوومـەوە، دڵم پارچە

پارچــە بوو.. لەم کاتەدا خودای پەروەردگار بــۆ دڵنەوایی ئیمانداران ئەم ئایەتە پیرۆزانەی نــاردە خــوارەوە ﴿ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴿٤٥﴾ ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾الحجر. واتــە: (بە ڕاســتی خوانــاس و پارێــزکاران لە نــاو باخەکانی بەهەشــت و کانیاوە ســازگارەکاندان ● پێیان دەوترێت فەرموو بچنە ناوی بە ســەلامەتی و سەلامەتان لە ســەر بێت، ژیانی پڕ ئاسودەیی تیادا بەرنە ســەر ● لە کاتێکدا هەرچی کینە و بوغــزە لە دڵ و دەرونیاندا دەرمان کێشــا و ئەو بەختەوەرانە بــرای یەکترن و لە سەر کورسی و قەنەفە ڕازاوەکان لە بەرامبەر یەکەوە دانیشتوون)..

بەڵێ.. ئەمانە ئەو کەســانەن، لەکاتی نوێژەکانیانــدا بیر لەوکاتە دەکەنەوە، وابەســەر پردی (صراط) دا بەرەو بەهەشــت هەنگاو دەنێن، ئەو پردەی لەســەر پشــتی دۆزەخ دروســت کــراوە، هەنگاونان لەوشــوێنەدا ئاســان نیــە، ئەوپردەی لەمــوو باریکتــرە، هەروەها لە شمشــێریش تیژتــرە.. ئەو کەســانە مافی خۆیانە لەنوێژەکانیاندا بلەرزن وەکو داری بی چۆن لەئاودا دەلەرزێت..

بــراو خوشــکی ئازیــز: هەر لــەو ڕۆژەداو هــەر لــەو هەلوێســتەدا هەندێك لەخەڵکی حاڵیان پێچەوانەی حاڵی بەندە چاکەکانی خودایە..

لەو ڕۆژەدا کە تاریکی باڵ بەسەر هەموو شتێکدا دەکێشێ، ئەو ڕۆژەی کەخۆر نامێنێ و فڕێ دەدرێتە ناو دۆزەخەوە، ئەســتێرەکان وردوخاش دەبن، شاخەکان وەکو خوری شــی دەبنەوە، ئاســمانەکان پارچەپارچە دەبن، لەو ڕۆژەدا هەندێك لــە خەڵکــی بەکوێری حەشــر دەکرێــن و هیچ شــتێك نابینن، هەروەکــو خودای گەورە دەفەرموێــت: ﴿ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتۡكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَاۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي مَنۡ أَسۡرَفَ وَلَمۡ يُؤۡمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦۚ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبۡقَىٰٓ ﴿١٢٧﴾ ﴾طه. واتە: (ئەو کەســەی ڕوو وەردەگێڕێ لە بەرنامەو ڕێبازی خوداو پشتی تێ دەکات، بێگومان بۆ ئەو جۆرە کەسانە ژیانێکی ترش و تاڵ و ناخۆش پێش دێت، لەڕۆژی قیامەتیشــدا بەکوێری حەشری دەکەین ● ئەو کەسەش دەڵێت: ئەی پەروەردگار بۆ بە کوێری حەشرت کردم؟ خۆمن کاتی

خۆی چاوم ساغ بوو● خودای گەورەش دەفەرموویت: تۆبەوشێوەیە بوویت و کوێر بوویت لەئاستی ئایات و بەڵگەکانی ئێمەدا کاتێك کە پێت ڕادەگەیەنرا، ئێمەش ئەمڕۆ ئاوا مامەڵەی کەسێکی لەبیر کراوت لەگەڵ دەکەین● ئابەو شێوەیە تۆڵە لەو کەسە دەکەینەوە کە سنوور دەبەزێنێت و باوەڕ بە فرمانەکانی پەروەردگار ناهێنێت، بێگومان سزای قیامەت زۆر سەخت ترو بەردەوام ترە)..

بەڵام مـوژدە بێت هەر لەو ڕۆژەدا، هەندێك کەس لەلایەن خودای گەورەوە بەقەد شاخەکان ڕووناکیان پێ دەدرێت و هەتا چاو بڕکات ڕووناکیەکەیان دەڕوات و پێشیان بۆ ڕووناك دەکاتەوە، هەرکەسەو بەقەد کردارە باشەکانی ڕووناکی پێ دەدرێت، کەسی واش هەیە ڕووناکیەکەی تەنها لەپەنجەی قاچیدایەو جارێك ڕووناکی بۆدەکات و جارێکیش خامۆش دەبێت، کەسانی واش هەن بە تاریکی دەڕۆن هیچ ڕووناکیەکیان نیە، کەسی واش هەیە پەنا بەخودا بەکوێری حەشر دەکرێت وەکو لە ئایەتەکەی پێشوودا باسمان کرد..

خودای گەورە دەفەرمویت:﴿ يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ
وَبِأَيْمَٰنِهِم بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾
يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ
فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ ﴿١٣﴾
يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَٱرْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ
ٱلْأَمَانِىُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿١٤﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ ۚ مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ ۖ هِىَ مَوْلَىٰكُمْ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٥﴾﴾الحديد. واتە: (ڕۆژێك دێت
کە دەبینیت پیاوانی ئیماندارو ژنانی ئیماندار بەرەو بەهەشت بەڕێ دەکرێن، نورو ڕووناکیەکی ئاشکرا لەبەردەم و لەلای ڕاستیانەوە دەڕوات و فریشتەکان پێیان دەڵێن: مژدەی ئێوە ئەمڕۆ باخەکانی بەهەشتە،کە چەندەها ڕووبار بە ناویاندا دەڕوات، هاوڕێ لەگەڵ ژیانی هەمیشەیی و نەبڕاوە تیایدا، ئا ئەوەیە سەرکەوتن و سەرفرازی گەورەو بێسنوور● ئا لەو ڕۆژەدا کە ئیمانداران بەرەو بەهەشت بەڕێ دەکرێن، پیاوان و ژنانی دووڕوو دەهێنرێنە سەر ڕێگەیان، بەغەمبارییەوە بۆ ئیمانداران دەڕوانن، ئیماندارانیش هیچ لایان لێ ناکەنەوە،

بۆیە بەغــەمو پەژارەیەکــی زۆرەوە پێیان دەڵێن: دەی تەماشــایەکمان بکەن، با لە نوری ڕوخســارتان بەهرەوەر بیــن، بەڵام پێیان دەوترێــت: بگەڕێنەوە دواوە، خۆتان بەشوێن نورو ڕووناکیدا بگەڕێن، دەستبەجێ دیوارێك درووست دەکرێت لەنێــوان ئیمانــداران و دووڕووەکانــدا، دەروازەیەکیشــی تێدایــە، دیــوی ناوەوە کەڕووی لە ئیماندارانە، ڕووی لە ڕەحمەت و بەهەشــتە، دیوی دەرەوە کەڕووی لە دووڕووەکانە، ڕووی لە ســزاو دۆزەخە ● ئینجــا دووڕووەکان هاوار لە ئیمانداران دەکەن و دەڵێن: ئایا ئێمە هاوڕێی ئێوە نەبووین؟! ئێمە هاوکاری ئێوە نەبووین؟! ئیمانــداران دەڵێــن: بەڵــێ وایە، بــەڵام ئێوە خۆتــان تووشــی دووڕوویی و پیلان گێــڕی کرد، خۆتان مەڵاس دابوو، بۆ فرســەت دەگەڕان کــە زەرەر لە ئیمانداران بدەن و هەمیشــە لە گومــان و دوودڵیدا دەژیان و بڵاویشــتان دەکــردەوەو هیواو ئاواتی بێجێ ســەری لێتێکدابوون، هەتا ویســتی خودا یەخەی پێ گرتن و کۆتایی بەژیانتان هات، شــەیتانیش گومڕای کردبوون و لەڕێبازی خــودا وێڵی کردبوون ● ئەمــڕۆ ئیتر هیــچ پاکانەیــەك لەئێوەو بێبــاوەڕان وەرناگیرێت، شــوێنەوارو مەنزڵگای هەمووتان دۆزەخە، هەر ئەوەش شایســتەتانە، ئای چ ســەرەنجامێکی خراپ و نالەبارە)!!

هەروەها خودای گــەورە لەئایەتێکی تــردا دەفەرموێت:﴿ وَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ مُّقَرَّنِينَ فِى ٱلْأَصْفَادِ ﴿٤٩﴾ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ وَتَغْشَىٰ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ﴿٥٠﴾ ﴾ابراهيم. واتە: (تاوانباران دەبینی بەزنجیر بەستراونەتەوەو پێش دەدرێن لەناشــرینترین شــێوەدا بــەرەو ناڕەحەتتریــن ئێــش و ئــازار ● هەروەها جۆرە بەرگێکیان لەبەردایە وەك ئەوەی ماددەی ســوتێنەری تێدا بێت و زیاتر ئازاریان بدات).. هەندێك لەو کەســانە ئەوانە بوون کــە گرنگیان بەنوێژەکانیان نەئەداو ساردوسڕییان لێ دەکرد..

هەروەهــا خودای گــەورە دەفەرموێــت:﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرْكَعُوا۟ لَا يَرْكَعُونَ ﴿٤٨﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ ﴾المرسلات. واتــە: (خۆ ئەگەر پێیــان بووترێت: کڕنوش بــەرن و مــل کەچی فەرمانی خودابن، ئــەوا مل کەچ نابن ● هــاوارو وەیل بۆ ئەو کەسانەی کە بڕوایان بە پێغەمبەران و ڕۆژی دوایی نەبوو)..

ئای چەند چارەڕەشن؟! چۆن پێش دەدرێن بۆ سەختترین ئازارو ئێش؟! دەبێت حاڵیـان چۆن بێت، کاتێـك ڕاپێچی دۆزەخێکی برسـی دەکرێن و دۆزەخیش هەر دەڵێت: ﴿ هَلْ مِن مَّزِيدٍ ﴾؟ ئایا زیاتر هەیە؟

خۆزگـە دەمانزانی حاڵیـان چۆنە کاتێـك لێیان دەدرێت بەگورزی ئاسـنین! خۆزگـە دەمانزانـی حاڵیان چۆنــە کاتێك خۆراکی تــاڵ و ناخۆشـیان دەرخوارد دەدرێت! خۆراکێك لە کێم و خوێن و زوخاو! ئای چەند ناڕەحەتە! سوێند بەخودا ئەوانە لە خراپترین دروستکراوەکانی خودان..

## فەزڵ و گرنگی نوێژ

نوێژ پەیوەندی نێوان بەندەو خودایە، بەهۆی نوێژەوە دڵی بەندە چاکەکان، باڵندە ئاسا بەرز دەبێتەوە بەرەو لای خودا..

نوێـژ چەنـدان فـەزڵ و پلەو پایـەی هەیە لـە دونیـاو ڕۆژی دوایشـدا، نوێژ هۆکارێکـە بۆ ئەنجامدانی چاکە، هەروەها هـۆکارە بۆ دوورکەوتنەوە لە خراپەو ڕێگەی چەوت..

ئەنجامدانی نوێژ بەڕێکوپێکی بەدەست هێنانی پاداشت و پلەو پایەی گەورەیە، دەبێتە هۆی سڕینەوەی گوناهو تاوان، یەکەم کردەوەشە کە لێپرسینەوەی مرۆڤی لە سـەر دەکرێت لـەڕۆژی دوایدا.. خـودای گـەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱتْلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾العنكبوت. واتـە: (ئـەی پێغەمبەر ﷺ ئـەوەی بۆت ڕەوانـە دەکرێت لەقورئـان بیخوێنـەرەوەو نوێژیش بەچاکی ئەنجـام بـدە، چونکـە بەڕاسـتی نوێژ بەرهەڵستی گوناهـو تاوان و نادروسـتی دەکات)..

هەروەهـا دەفەرموێـت: ﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ ﴾الاسراء. واتـە: (ئـەی پێغەمبەر ﷺ، ئـەی ئیمانـدار، نوێژ ئەنجـام بدە کاتێـك خۆر نیوەی ئاسـمان بەجێ دەهێڵێت (ئامازەیـە بۆ نوێژی نیوەڕۆو عەسـر) لەتاریکی شەویشـدا (نوێـژی مەغریب و

عیشا) ئەنجام بدە، نوێژی بەیانیش (کە زۆر قورئانی تێدا دەخوێنرێت فەراموش مەکە) بەڕاستی قورئان خوێندنی نوێژی بەیانی دەبینرێت (لەلایەن فریشتەکانەوە)).. هەروەها خودای گەورە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت:
﴿ حَـٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلْوُسْطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ ﴾ البقرة.
واتە: (کەمتەرخەمی مەکەن و پارێزگاری لە ئەنجامدانی نوێژەکاندا بکەن، بەتایبەتی نوێژی ناوەند (کە نوێژی عەسرە) هەمیشەو بەردەوامیش هەستن بە ئەنجامدانی فەرمانەکان بۆ خودا بەگەردن کەچیەوە).. پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت: (أرَأيتُم لو أنَ نَهراً ببابِ أحدِكُم يَغتَسِلُ منهُ كُلَ يَومٍ خَمسَ مَرّات، هَل يَبقى مِن دَرَنِه شيء؟ قالوا: لا يَبقى مِن دَرَنِه شيء، قال: فذالكَ مثلُ الصَلَواتِ الخَمس، يَمحو اللهُ بِهنَ الخَطايا)[5]. واتە: (ئایا دەبینن ئەگەر ڕووبارێك لە بەردەم دەرگای یەکێکتانەوە بڕوات و هەموو ڕۆژێك پێنج جار خۆی لێبشوات، ئایا هیچ پیسیەکی پێوە دەمێنێ؟ وتیان: نەخێر هیچ پیسیەکی پێوە نامێنێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە وەك نموونەی پێنج فەرزەی نوێژ وایە، خودای گەورە بەهۆی ئەو نوێژانەوە گوناهەکان دەسڕێتەوە)..

عبدالله ی کوڕی مەسعود ﷺ دەفەرموێت: (پرسیارم لە پێغەمبەری خودا ﷺ کردو وتم: کام کردارانە زۆر باشن؟ فەرمووی: (الصَلاةُ عَلى وَقتِها، قُلتُ: ثُمَ أيّ؟ قال: بِرُ الوالِدَين، قُلتُ: ثُمَ أيّ؟ قال: الجِهادُ في سَبيلِ الله)[6]. واتە: (یەکەم کرداری زۆرباش ئەوەیە کە نوێژ لەکاتی خۆیدا ئەنجام بدەیت، وتم ئەی دوای ئەوە؟ فەرمووی: چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوك، وتم: ئەی دوای ئەوە؟ فەرمووی: تێکۆشان لە پێناوی خوادا)..هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (إنَ أولُ ما يُحاسَبُ النّاس بِه يَومَ القيامةِ مِن أعمالِهم الصَلاة...). واتە: (یەکەم شتێك کە خەڵکی لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت لە ڕۆژی قیامەتدا لە کردەوەکانیان، بریتیە لە نوێژ)..

---

٥-رواه البخاري ٥٢٨ ومسلم٦٦٧.

٦-متفق عليه.

# فەزڵ و پلەو پایەی نوێژی عەسرو بەیانی

ئاینی ئیسلام لەنێو پێنج فەرزەکەی نوێژدا، زیاتر جەختی لەسەر هەندێکیان کردۆتەوەو گرنگی تایبەتی پێداون و خێرو پاداشتەکەشیان گەورە ترە، لەوانەش نوێژی (عەسرو بەیانی)، چونکە ئەم دوو نوێژە کاتەکانیان ناسکن و خەڵکی خەریکی ئیسراحەتن و نوێژکردن تا ڕادەیەك نارەحەتی تێدایە لەم کاتانەدا، بەڵام ئەمە مانای پشتگوێ خستنی نوێژە فەرزەکانی تر نیەو هەموو نوێژە فەرزەکان گرنگی خۆیان هەیە..

پێغەمبەر ﷺ لەباسی فەزڵی نوێژی بەیانی و عەسردا دەفەرموێت: (لَن يَلِجَ النـار أَحدٌ صَلّى قَبلَ طلوعِ الشَمسِ وقَبلَ غروبها) يعني: الفجـر والعصر[٧]. واتە: (ئاگری دۆزەخ نابینێت ئەوکەسەی پێش خۆرکەوتن و پێش خۆر ئاوابوون نوێژ ئەنجام بدات) مەبەست لە (نوێژی بەیانی و عەسرە)..

هەروەها دەفەرموێت: (مَـن صَلّـى الصُبـحِ، فَهـوَ فـي ذِمـةَ الله...)[٨]. واتە: (هەرکەسێك نوێژی بەیانی ئەنجام بدات لەپارێزگاری خوادا دەبێت...).. هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ لەفەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: (مَن صَلّى البَردَينِ دَخَلَ الجَنة)[٩]. واتە: (هەرکەسێك نوێژی بەیانی و عەسر ئەنجام بدات دەچێتە بەهەشتەوە).. لەبەرئەوەی کاتی نوێژی بەیانی کاتێکی خۆشە بۆ خەوو شەیتانیش هەوڵ دەدات کە زیاتر خەوت لا خۆشەویست بکات و نوێژەکەشت لا قورس بکات و کاتی نوێژی عەسریش زیاتر خەڵکی خەریکی کارو کاسبی و بازرگانین..

ئەبو هورەیرە ﷺ لەپێغەمبەری خوداوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: (يَتَعاقَبـونَ فيكُم مَلائكـة بِاللَيلِ ومَلائكـة بِالنَهار، وَيَجتَمِعونَ فـي صَلاةَ الصُبحِ وصَـلاةِ العَصر، ثُـمَ يَعرُجُ الذيـنَ باتُو فيكُـم، فَيَسـألُهُمُ الله- وَهوَ أعلَـمُ بِهِم- كَيفَ

---

٧-رواه مسلم ٦٣٤.

٨-رواه مسلم ٦٥٧.

٩-متفق عليه (البخاري ٥٧٤ ومسلم ٦٣٥).

تَرَكتُم عِبادي؟ فَيَقولونَ: تَرَكناهُم وَهُم يُصَلّون، وأتَيناهُم وَهُم يُصَلّون)[١٠]. واتە: (چاودێری دەكرێن لەلایەن فریشتەوە بە شەوو ڕۆژ، فریشتەیەك لەشەوداو فریشتەیەك لە ڕۆژدا، كۆدەبنەوە لە نوێژی بەیانیو نوێژی عەسردا، پاشان فریشتەكان سەردەكەون لەدوای ئەوەی لەلاتان مانەوە، خودای گەورە لێیان دەپرسێت- لەكاتێكدا خودای گەورە زاناترە بەحاڵتان لەوان- چۆن بەندەكانی منتان بەجێهێشت؟ ئەوانیش دەڵێن: كاتێك بەجێمان هێشتن نوێژیان دەكردو كاتێكیش چوین بۆلایان نوێژیان دەكرد)..

ئەگەر ئەم فەرموودانە نوێژی عەسرمان لەلا خۆشەویست نەكەن، ئەوا پێغەمبەری خودا ﷺ بەم فەرموودەیە دەمانترسێنێت كە دەفەرموێت: (مَن تَرَكَ صَلاةَ العَصرِ فَقَد حَبِطَ عَمَلُهُ)[١١]. واتە: (هەركەسێك واز لە نوێژی عەسر بێنێت ئەوا كردەوەكانی پوچو بێ كەڵك دەبنو خەسارەت مەند دەبێت)..

## فەزڵی نوێژی جەماعەت

كۆمەڵو جەماعەت ڕەحمەتن، جیاوازیش سزاو ناڕەحەتیە، نوێژی جەماعەتیش بەهێزیی گیانی برایەتیە، هەروەها نوێژی جەماعەت هاوشێوەی ڕیزی فریشتەكانە لە ئاسمان، هەروەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلصَّآفُّونَ ﴿١٦٥﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلْمُسَبِّحُونَ ﴿١٦٦﴾ ﴾ الصافات. واتە: (بەڕاستی ئێمە هەر هەموومان بەڕیز وەستاوین (ئامادەی فەرمانین)، دووبارە دەڵێن: ئێمە هەمووەم سەرگەرمی تەسبیحاتو ستایشی خودای میهرەبانین)..هەروەها دەفەرموێت: ﴿ وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفًّا ﴿١﴾ ﴾ الصافات. واتە: (سوێند بە فریشتە ڕیز بووەكان)..

نوێژی جەماعەت بەلای زۆربەی زانایانەوە فەرزە، هەروەك لەم ئایەتو فەرمودانەدا ئاماژەی پێكراوە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَٱرْكَعُوا۟ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾ البقرة . واتە: (لەگەڵ كڕنوش بەراندا كڕنووش بەرن. بۆ پەروەردگارتان)..

لەبەر گرنگیو بایەخی نوێژی جەماعەت،ئیمانداران لەكاتی غەزاو

---

١٠-متفق عليه (البخاري٥٧٤،ومسلم٦٣٢).

١١-رواه البخاري٥٥٣.

جەنگیشـدا پێویسـتە نوێژەکانیان بەجەماعەت ئەنجام بدەن، هەروەك خودای گـەورە دەفەرموێـت:﴿ وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓاْ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ ﴿١٠٢﴾ ﴾النساء. واتە: (کاتێك تۆ ئەی پێغەمبەری خـودا ﷺ لە ناو هاوەڵانتدا بوویت و پێـش نوێژیت بۆ دەکـردن - لەکاتی جەنگدا -، ئەوا با دەسـتەیەکیان لەگەڵ تۆدا بوەسـتن بۆ نوێژو چەکەکانیان پێبێت، کاتێك ئەم دەسـتەیەی کـە نوێژ دەکات چونە سـوجدە، بـا ئەوانەی تر لە پشـتیانەوە بن، پاشـان کە ئەمـان لێبوونەوە ئەو دەسـتەیەی کە پاسـەوانییان دەکرد بابێن لەگەڵ تـۆدا نوێژەکەیان بکەن، با هۆشـیارو چەکداریـش بن...)..پێغەمبەری خـوداش ﷺ دەفەرموێـت: (صَلاةُ الجَماعَةِ أَفضَلُ مِن صَلاةِ الفَذِّ بِسَـبعٍ وَعشرِينَ دَرَجَة).[١٢] واتە: (نوێژی جەماعەت بیسـت و حەوت پلە باشـترە لە نوێژێك، کـە بەتەنها ئەنجام بدرێـت).. هەروەها دەفەرموێـت: (والذي نَفسـي بِيَـدِه لَقَد هَمَمـتُ أَن آمُـرَ بِحَطَبٍ يحتَطَبُ ثُـمَّ آمُرَ بالصَـلاةِ فَيُؤذَنُ لَها، ثُمَّ آمُرَ رَجُلاً فَيَؤُمُّ النّاسَ ثُـم أخالِفُ إلى رِجالٍ فَأُحرِقُ عَلَيهِم بُيُوتَهُم)[١٣]. واتە: (سـوێند بەو کەسـەی گیانی منی بەدەستە ویستم فەرمان بکەم بـەوەی کـە دار کۆ بکەنەوەو پاشـان فەرمان بە کەسـێك لە ئێوە بکـەم کە پێش نوێژی بۆ خەڵکەکە بکات و بچینە سـەر ئەوانەی کە نوێـژ بە جەماعەت ناکەن، هەتا ماڵەکانیان بەسـەردا بسـووتێنین).. هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (مَن سَـمِعَ النِّداءَ فَلَم يَأتِ فَلا صَلاةَ لَهُ إلاّ مِن عُذرٍ )[١٤]. واتە: (هەرکەسێك گوێی لە بانـگ بێت و نەچێت بە دەمیەوە، یاخود نەچێت بۆ مزگەوت، ئەوا ئەو نوێژە بۆ ئەو نیە، تەنها لە حاڵەتێکدا نەبێت کە بیانوو عوزری هەبێت).. ئەمەش دەبێتە بەڵگـە بـۆ هەموو ئەو کەسـانەی کە گوێیـان لەبانگە، دەبێت بچـن بۆ مزگەوت، ئەگەر چاویان نەبینێت و نابیناش بن، هەروەك ئەبو هورەیرە ﷺ دەگێڕێتەوەو

١٢-البخاري ٦٤٥ و مسلم ٦٥٠.

١٣-البخاري ٦٤٤ ومسلم ٦٥١.

١٤-ابن ماجه ٧٩٣ وابن حبان ٢٠٩٥ .

دەفەرموێت: (عبدالله ی کوری أم مکتوم) کە نابینا بوو هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من کەسێکم نیە چاو ساغم بێت و بمهێنێ بۆ مزگەوت و داوای رووخسەتی کرد بۆ ئەوەی لە مالەوە نوێژەکانی ئەنجام بدات، پێغەمبەریش ﷺ رووخسەتیدا، بەلام کاتێك رۆیشت، پێغەمبەر ﷺ بانگی کردو پێی فەرمووو: (هَل تَسمَعُ النِّداءَ بِالصَّلاة؟ قال: نَعَم، قال: فَأَجِب)[١٥]. واتە: (ئایا گوێت لە بانگ دەبێت لەکاتی نوێژەکاندا؟ ووتی: بەلێ، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: دەی واجبە بێی بۆ مزگەوت)..

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە (عبدالله ی کوری أم مکتوم) کە بانگ دەری پێغەمبەری خودا ﷺ بووە فەرموویەتی: (ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ شاری مەدینە حەشەراتی زیان بەخشی وەك دووپشك و ئاژەلی دڕندەی وەك گورگ و سەگی هاری زۆرە، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: (تَسمَعُ حَيَ عَلَى الصَّلاة،حَيَ عَلَى الفَلاح، فَحَيهَلاَ) أي تَعال[١٦]. واتە: (مادام گوێت لە (حَيَ عَلى الصَّلاة، حَيَ عَلى الفَلاح) دەبێت، وەرە).. لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (مامِن ثَلاثَة في قَريَة وَلا بَدو لاتُقامُ فيهِمُ الصَّلاةَ إلا إستَحوَذَ عَلَيهِمُ الشَيطان، فَعَلَيكُم بالجَماعَة، فإنَما يَأكُلُ الذِئبُ مِن الغَنَم القاصية )[١٧]. واتە: (ئەگەر لە دێیەك یان دەشتێك سێ کەس هەبوون و جەماعەتیان نەکردئەوا شەیتان بەسەریاندا زاڵ دەبێت، دەی کەواتە پابەند بن بە کۆمەل و جەماعەتەوە، چونکە بە دلنیاییەوە گورگ ئەو مەڕە دەخوات کە لە ڕانەکەی دابڕابێت)..

هەروەها لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (مَن صَلى للهِ أَربَعيـَن يَوماً في جَماعَة، يُدرِكُ التَكبِيرة الأُولى، كُتِبَ لَهُ بَراءَتان، بَراءَةٌ مِنَ النّار وَبَراءَةٌ مِنَ النِفاق)[١٨]. واتە: (هەرکەسێك لەبەر خاتری خودا چل ڕۆژ نوێژەکانی بە بەردەوامی لە مزگەوتدا ئەنجام بدات و بە (الله أکبر) ی یەکەمدا بگات، ئەوا

---

١٥-مسلم٦٥٣.

١٦-رواه أبو داود.

١٧-رواه أحمد ٢١٢٠٣ وأبو داود ٥٤٧.

١٨-صحيح جامع الصغير ٦٣٦٥.

خودای گەورە لە دوو شت دەیپارێزێ‌و ڕزگاری دەکات، یەکەم: لە ئاگر دەیپارێزێ‌و نایسوتێنێ، دووەم: لە دوڕوویی دەیپارێزێ‌و بە دووڕوو نایژمێرێ)..

کەواتــە بەپێی ئــەم فەرمــوودە پیرۆزانە بێــت، نوێژی جەماعــەت فەرزەو پێویستە کاتێك گوێمان لە (الله أكبر) ی بانگ دەبێت ئەگەر خەوتووین، هەستین، ئەگــەر خەریکی ئیــش‌و کارین، دەســت هەڵگرین‌و وەڵامی بانگەکــە بدەینەوەو بەرەو مزگەوتەکان بکەوینە ڕێ..

❖ ئیبراهیمــی مــەروزی زەڕەنگــەر بــوو، کاتێــك چەکوشــەکەی بــەرز بکردایەتــەوەو گوێــی لــە بانــگ بووایــە، چەکوشــەکەی نەدەدایــەوە بــە زێڕو زیوەکەیداو یەکسەر دەستی لە کار هەڵدەگرت‌و بەرەو مزگەوت دەکەوتە ڕێ..

## هەنگاونان بەرەو مزگەوت

گەورەتریــن‌و بەڕێزتریــن شــوێنی ســەر زەوی، مزگەوتەکانــی خــودای پەروەردگــارن، مزگــەوت شــوێنی پەرســتنی خودایە، شــوێنی لێخۆشــبوونە لە گوناهــو تاوان، هەروەهــا نوێژێك ئەگەر بەجەماعەت بکرێــت لە مزگەوتەکاندا خێری بیســت‌وحەوت نوێژی هەیە کــە بەتەنها ئەنجام بدرێ (الصَـلاةُ الجماعَةُ تفضل صَلاةَ الفَذ - الفرد- بسَبعٍ وَعَشرينَ دَرَجَة)[١٩].. بە هەر هەنگاو نانێکت بەرەو مزگەوت گوناهو تاوانێکت ئەســڕڕێتەوەو پلەیەکیش لەلای خودای پەروەردگار بەرزو بەڕێز دەبیت، پێغەمبــەر ﷺ دەفەرموێت: (مَن تَطَهَّرَ في بَيتِه ثُمَّ مَضَى إلــى بَيت مِن بيُــوتِ الله ليَقضيَ فَريضَةً مِــن فَرائضِ الله، كانَــت خُطواتُهُ إحداهُما تَحُــطُّ خَطيئَــة، والأُخرى تَرفَــعُ دَرَجَة)[٢٠]. واتە: (هە رکەســێك لەماڵەوە دەســت نوێژبگرێــت، پاشــان بچێت بــۆ ماڵێك لــە ماڵەکانی خــودا، بــۆ جێبەجێکردنی فەرزێــك لــە فەرزەکانــی خودا، هــەر هەنگاوێــك لــە هەنگاوەکانــی دەبنە هۆی سڕینەوەی گوناهو تاوانەکانی‌و بەرزبوونەوەی پلەو پایەی)..

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه لەپێغەمبەری خوداوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

---

١٩-رواه البخاري ٦٤٥ ومسلم ٦٥٠.

٢٠-رواه مسلم ٦٦٦.

(ألا أدُلُّكم علَى ما يَمحُو اللهَ بِه الخَطايا، وَيرفَعُ بِه الدَرجات؟ قالو: بَلى يارَسـولَ الله، قال إسـباغُ الوضُوءِ عَلَـى المَكارِه، وكَثرَةُ الخُطا إلىَ المَسـاجِد، وَإنتِظارَ الصَّلاةِ بَعدَ الصَـلاةِ، فَذلِكُمُ الرِّباط، فَذلِكُمُ الرِّباط)[٢١]. واته: (ئایا ڕێنمایتان بکەمو پێتان بڵێم چی دەبێتە هۆی سڕینەوەی گوناهو تاوان و پلەو پایەشتان بەرز دەکاتەوە؟ وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: دەست نوێژگرتن لە کاتی ناڕەحەتیدا (وەك سەرماو گەرما)، وە زۆر هەنگاونان بەرەو مزگەوت، وە لـەدوای هەر نوێژێك چاوەڕوانی نوێژێکی تر بکەیت، ئا ئەوە جیهادو تێکۆشـانە لە ڕێی خوادا، ئا ئەوە جیهادو تێکۆشانە لە ڕێی خوادا)..

هەروەهـا دەبێت ئـەوەش بزانین، هەنگاوەکان چەندێـك زۆربن، ئەوا خێرو پاداشتەکەشـی زۆرترە، هەنگاونـان بەرەو مزگەوت و گەڕانـەوەش لە مزگەوت، بە هەمان شـێوە دەبێتە هۆی بەدەسـتهێنانی پاداشـت.. هەروەها ئەو کەسانەی ماڵەکانیـان لـە مزگەوتەکانەوە دوورە خێرو پاداشـتیان زۆرترە لەو کەسـانەی کـە نزیکن لە مزگەوتەکانەوە، لەبەر دووری و گەرماو سـەرماو ناڕەحەتی ڕێگە، ئەمـەش بەپێـی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کـە دەفەرموێـت: (إنَّ أعظَمَ النّاس أجرَاً في الصّلاةِ، أبعَدُهم إلَيها مَمشي....)[٢٢]..

لـەدوو فەرمـوودەی پیـرۆزدا پێغەمبـەری خودا ﷺ وەسـفی ئەو کەسـانە دەکات کە زۆر هاتووچۆی مزگەوت دەکەن و دەفەرموێت: (إذا رَأيتُمُ الرَّجُلَ يَعتادُ المَسـاجِدَ، فَأشـهِدوا لَهُ بِالأيمان)[٢٣]. واتە: (ئەگەر پیاوێکتان بینی زۆر هاتووچۆی مزگەوتی دەکرد و خووی پێوە گرتبوو، ئەوا شایەتی ئیمانی بۆ بدەن).. هەروەها یەکێك لەو حەوت کۆمەڵەی کە لەکاتی گەرماو ناڕەحەتی ڕۆژی قیامەتدا خودای گەورە دەیان خاتە ژێر سێبەری خۆیەوە، بریتیە لەو کەسانەی کە دڵیان پابەندە بە مزگەوتەکانەوە (وَرَجُلٌ قَلبُهُ مُعَلَقٌ بِالمَساجِد)[٢٤]..

---

٢١-رواه مسلم ٢٥١.

٢٢-متفق عليه (البخاري ٦٥١ و مسلم ٦٦٢).

٢٣-رواه الترمذي.

٢٤-رواه البخاري ومسلم.

# ئامادەبوونی نوێژی جەماعەتی بەیانی و عیشا

وەکو باسمان کرد ئامادە بوون لە نوێژی جەماعەتدا خێرو پاداشتێکی زۆری هەیە، هەروەها زۆر هاتووچۆ کردنی مزگەوت، دەبێتە هۆی سڕینەوەی گوناهو تاوان و بەرزبوونەوەی پلەی ئیماندار لەلای خودای پەروەردگار، لەناو نوێژەکانیشدا ئەنجام دانی نوێژی بەیانی و عیشا تایبەتمەندی و گرنگی تایبەتی خۆی هەیە، هەرچەندە زەحمەت و ناڕەحەتیشی تێدا بێت، بەڵام لە توانای مرۆڤ بەدەر نیە، هەروەك خودای پەروەدگار دەفەرموێت: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ...(٢٨٦)﴾ البقرة. واتە: (خودای گەورە ئەرك ناخاتە سەر هیچ کەسێك، مەگەر بە ئەندازەی توانای خۆی نەبێت)..

ئەبو هورەیرە رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (لَو يعلَمُ النَّاس مافي النِّداء وَالصَّف الأَول، ثُمَّ لَم يَجدوا إلاّ أن يَستَهِموا عَلَيه، وَلَو يَعلمونَ مافي التَّهجير، لاَستَبَقُوا إليه، وَلويَعلَمونَ مافي العَتَمَة وَالصُّبح لأَتَوهُما وَلَو حَبْوا)[٢٥]. واتە: (ئەگەر خەڵکی دەیانزانی چ خێرو پاداشتێك لە بانگ دان و ڕیزی یەکەمی جەماعەت دا هەیە، ئەوا تیرو پشکیان بۆ دەکرد، وە ئەگەر دەیانزانی چ خێرو پاداشتێك لە (الله أكبر) ی نوێژ دابەستندا هەیە ئەوا پێشبڕکێیان بۆ دەکرد، وە ئەگەر دەیانزانی چ خێرو پاداشتێك لە نوێژی جەماعەتی عیشاو بەیانیدا هەیە ئەوا دەهاتن، ئەگەر لەسەر دەست و ئەژنۆکانیشیان بوایە)..

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (مَن صَلَّى العشاءَ في جَماعَة، فَكَأنَّما قامَ نِصفَ اللَّيل، وَمَن صَلَّى الصُّبحَ في جَماعَة فَكَأنَّما صَلَّى اللَّيلَ كُلَّه)[٢٦]. واتە: (هەر کەسێك نوێژی عیشا بە جەماعەت ئەنجام بدات، وەك ئەوە وایە کە نیوەی شەوێك شەو نوێژی کردبێت، وە هەرکەسێك نوێژی بەیانی بەجەماعەت ئەنجام بدات، وەك ئەوە وایە کە هەموو شەوەکە شەو نوێژی کردبێت)..

---

٢٥-متفق عليه (البخاري ٦١٥ ومسلم ٤٣٧).

٢٦-رواه مسلم ٦٥٦ وابو داود ٥٥٥.

ئامـادە بوونــی نوێــژی بەیانی و عیشـا و ئەنجـام دانیـان بە جەماعــەت، لە سـیفەتی ئیماندارانەو بە پێچەوانەشــەوە، پەنا بەخودا لە سـیفەتی دووڕوانە، هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لَيسَ صَلاةٌ أثقَل عَلى المُنافقِينَ مِن صَلاةِ الفَجرِ وَالعِشاء، وَلَو يَعلَمونَ ما فِيهِما لأتَوهُما وَلَوحَبْوا)[٢٧]. واتە: (هیچ نوێژێك وەك نوێژی بەیانی و عیشـا لەســەر دووڕووەکان گران و زەحمەت نیە، خۆ ئەگەر بیان زانیایە چ خێرو پاداشـتێکی تێدایە، ئەوا دەهاتن ئەگەر لەســەر سـك و دەســت و ئەژنۆکانیشـیان بوایــە).. لەبــەر ئەوەی خــەو لەکاتی نوێژی بەیانیدا خۆشــە و هەســتان نارەحەت و زەحمەتەو کاتی نوێژی عیشاش خەڵکی لە ئیسراحەت دان، یاخود لە میوانی و ســەردانن.. هەر بۆیە پاداشــتی نوێژی بەیانی و عیشـا ئەگەر بــە جەماعەت ئەنجام بدرێت، هاوتایە لەگەڵ ئەوەی شــەو تا بەیانی شــەو نوێژ بکەیت، بەڵام بە داخەوە خەڵکی ئێســتا زۆر بە کەمی ئامادەی نوێژی جەماعەت دەبن، بە تایبەت عیشــاو بەیانــی و بەتایبەتی تریش نوێــژی بەیانی، لە هەندێ ناوچــەو گەڕەك مزگەوتەکان نوێژی عیشــاو بەیانییان تێــدا ناکرێت و دەرگای مزگەوتەکان دادەخرێت و تەنانەت بانگیشیان تێدا نادرێت.

شــێخ (نبيل العوضــي) دەفەرموێت: بانــگ خوێنی یەکێك لــە مزگەوتەکان پرســیاری کــردو وتــی: بەیانیان کاتێــك بانگ ئەدەم کەسـێك نایــەت، ئەوەندە چاوەڕێ دەکەم ئەترسم نوێژەکەم بچێت، ئایا دەبێت مزگەوتەکە دابخەم و بڕۆم بــۆ مزگەوتێکی تــر نوێژەکەم بکەم؟ پەنا بەخــودا لەگەڕەکێکــدا جگە لە بانگ خوێنەکە کەسێکی تر نەیەت بۆ مزگەوت[٢٨]!! لە کاتێکدا خودای گەورە لە وەسفی نوێژی بەیانیدا دەفەرموێت: ﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيۡلِ وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِۖ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا ﴿٧٨﴾ ﴾الاسراء.نوێژی بەیانــی فریشــتەکان دەیبینــن و ئامادەی دەبن و ســوننەتە قورئانی زۆری تێــدا بخوێنرێت، بەڵام زۆر بەداخــەوە، جاری وا هەیە ئەوانەش کە ئامادەی نوێژی جەماعەتی بەیانی دەبن لەبەر باوێشـك و خەواڵوویی تەنانەت نازانن پێش نوێژ کام ئایەت و کام سورەتی

---

٢٧-متفق عليه (البخاري ٦٥٧ ومسلم ٤٥١).

٢٨-کاسێتی (انين الفجر).

خوێندووە..

لێرەدا دەبێت ئاماژە بەوە بکەین تەنانەت دووڕووەکانیش لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ ئامادەی نوێژی جەماعەتی بەیانیو عیشا دەبوون، بەڵام وەکو خودای گەورە ئاماژەی پێدەکات، تەنها بەوە لە ئیمانداران جیا دەکرانەوە، کە نوێژەکانیان بە ساردو سڕیو خاوو خلیچکیەوە ئەنجام دەدا: ﴿وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٤٢﴾﴾ النساء.

واتە: (هەرکاتێك هەڵدەستن بۆ نوێژ، زۆر بە لەش گرانیو تەممەڵی هەڵئەستن، ئەوانە ڕیاو ڕوپامایی بۆ خەڵکی دەکەنو زۆر کەم یادی پەروەردگار دەکەن)..

تەنانەت (عبدالله ی کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول) سەرۆکی دووڕووەکانی شاری مەدینە ئامادەی نوێژە جەماعەتەکان دەبوو.

❖ لە شەوێك لە شەوەکانی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٨ لەیەکێك لە گەڕەکەکانی شاری سلێمانی مامەوە، کە ئەو گەڕەکە مزگەوتێکی زۆر خۆش و پاك و خاوێنیان هەیە، بۆ نوێژی بەیانی چووم بۆ مزگەوت، بۆئەوەی بە جەماعەت نوێژەکەم بکەم، کاتێك چووم پیاوێك جلو بەرگی خەوی لەبەردا بوو، خەریك بوو زۆپاکانی دائەگیرساند، پاشان ڕۆیی.. ماوەیەکی زۆری پێچوو، پیاوەکە هاتەوە، بەڵام من نەمزانی هەمان پیاوی پێشووە.. پیاوەکە وتی: نوێژەکەمان بکەین ؟ وتم: ئەی کەسی تر نایەت ؟ وتی: بڕوا ناکەم! وتم: ئەی ئەو پیاوەی کە جلو بەرگی خەوی لەبەردا بوو ؟ وتی: ئەوە من بووم، پاسەوانی مزگەوتەکەم، چووم لە ژوورەکەم جلەکانم گۆڕیو هاتمەوە.. بڕوابکەن ئەوەندە چاوەڕێمان کرد، خەریك بوو دنیا ڕووناك ئەبۆوەو زەردە دەرئەکەوت، کەس نەهات.. سەیرە لە گەڕەکێکدا تەنها کەسێك نایەت بۆ مزگەوت!! خۆ ئەگەر ئەو بەیانیە منیش نەچوومایە، ئەوا جەماعەت لەو مزگەوتەدا نەدەکرا..

ئەگەر بە گەنجێك بڵێی بۆ نایەیت بۆ جەماعەت؟! دەڵێ: ناتوانم.. خەبەرم نابێتەوە.. بەڕۆژ لە بازاڕ زۆر هیلاك دەبم!! ئەی بۆ خەبەرت ئەبێتەوە لەکاتێکدا لەگەڵ هاوەڵەکانتدا بەنیازی سەفەرەی؟! ئەی بۆ ئەگەر تاقیکردنەوەیەکی کەمێك قورست هەبێت بە دایك و باوکت دەڵێی بەیانی زوو خەبەرم بکەنەوە؟!

بەڵام بۆ نوێژەکەت ساردو سڕی!! مەبەستت نیە هەڵسیت!!

❖ مامۆستایەك دەفەرموێت سەردانی دواناوەندیەکم کرد،کەنزیکەی هەشت سەد قوتابی لاوی تێدا بوو.. واگومانم دەبرد کەئەم کۆمەڵە لاوە دەتوانن کاریگەرییان لەسەر گۆڕانی کۆمەڵگە هەبێت.. پێم وتن: پرسیارێکتان لێدەکەم و بە ڕاستی وەڵامم بدەنەوە.. کێ لە ئێوە نوێژی بەیانی بە جەماعەت کردووە؟ بڕوا بکەن لەو هەشت سەد کەسە تەنها بیست کەسیان وتیان نوێژی بەیانیمان بە جەماعەت ئەنجامداوە!! ئەی حەوت سەدو هەشتا کەسەکەی تر[٢٩]؟!

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (يا أَيُهَا النَّاس، أَفشُوا السَّلامَ، وَأَطعِمُوا الطَعامَ، وَصِلُوا الأَرحامَ، وَصَلُوا بِاللَّيلِ والنَّاسُ نِيام، تَدخُلُوا الجَنَةَ بِسَلام)[٣٠]. واتە: (ئەی خەڵکینە، سڵاو لە یەکتری بکەن و ئاشتی و ئارامی بڵاو بکەنەوەو خواردن ببەخشنەوەو سیلەی ڕەحم بەجێ بهێنن و سەردانی خزم و کەس بکەن و نوێژ بکەن لە شەودا، کاتێك کە خەڵکی خەوتوون، ئەوا بە ئارامی و ئاشتیەوە دەچنە بەهەشتەوە)..

لێرەدا پێغەمبەری خودا ﷺ باسی شەو نوێژ دەکات، ئەگەر ئێمە شەو نوێژ ناکەین، هیچ نەبێ با نوێژەکانمان بەجەماعەت ئەنجام بدەین..

❖ شەوێك (طاوس) لە پێش نوێژی بەیانیدا لە دەرگای یەکێك لە برادەرەکانی ئەدات، کاتێك دەرگای لێدەکەنەوە، پێی دەڵێن: لەم کاتەدا هاتووی؟! ئەویش دەڵێت: گومانم وابوو هیچ موسڵمانێك نیە لەم کاتە پیرۆزەدا بەخەبەر نەبێت و لە خودا نەپاڕێتەوەو خەریکی شەونوێژ نەبێت..

❖ بەندەیەك لە ماڵێکەوە دەفرۆشرێت بەماڵێکی تر، پێش نوێژی بەیانی ئەندامانی ماڵە تازەکە هەڵدەسێنێت لە خەوو پێیان دەڵێت: هەستن نوێژ بکەن.. خاوەن ماڵەکە دەڵێت: هێشتا بانگی نەداوە!! بەندەکەش دەڵێت: بۆ ئێوە تا بانگی بەیانی نەدات هەڵناستن بۆ نوێژ؟ ئەی شەونوێژ ناکەن؟! سوێند بەخودا لەم شەو زیاتر لە ماڵێکدا نامێنمەوە کە شەو نوێژی تێدا نەکرێت و دەچمەوە بۆ

---

٢٩-دموع المحراب- أبو عبدالرحمن.

٣٠-رواه أحمد ٢٣٢٧٢ والترمذي ٢٤٨٥ وابن ماجة ١٣٣٤.

ماڵەکەی پێشوو[٢١]..

لە سەردەمانی زوودا زۆربەی موسـوڵمانان کاتێك دەچوون بۆ نوێژی بەیانی چاویان دەرشـت بۆ ئەوەی گریان و فرمێسك و ئەسرینی شەو نوێژ بە چاویانەوە دیـار نەبێت، یاخود لە ترسـی ڕیاو ڕووپامایـی کاتێك بانگی ئەدا، بەشـێوەیەك دەنگیان بەرز دەکردەوە، بۆ ئەوەی دەورو بەریان وا بزانن تازە لە خەو هەڵدەستن، بەڵام ئێسـتا دەبینین مزگەوتەکان بێنازو چۆڵـن، خەڵکی زۆر بە کەمی ئامادەی نوێژی بەیانی دەبن، لە سـەردەمی پێغەمبەری خودا ﷺ و هاوەڵە بەڕێزەکانیدا ئەگـەر یەکێـك دیـار نەبووایە زوو بـەزوو دەزانـرا، چونکە بەردەوام لـە نوێژە فەرزەکاندا ئامادە بوون..

❖ با بزانین ئامادە بوونی نوێژی بەیانی بە جەماعەت لەلای هاوەڵان چەندە گرنــگ بووە، ئیمامی مالك لە کتێبـی (موطأ) دا دەگێڕێتەوە کە ڕۆژێك عومەری کـوڕی خەتتاب ﷺ لە نوێـژی بەیانیدا چـاوی دەگێڕا بۆ سـلێمانی کوڕی ئەبی حەسمە، کاتێك ئیمامی عومەر بەیانی دەچێت بۆ بازاڕو دایکی سلێمان دەبینێ و لێی دەپرسێت: بۆچی سلێمان لە نوێژی بەیانیدا ئامادە نەبوو؟! دایکی سلێمانیش دەڵێت: شەو خەریکی شەو نوێژ بوو، خەوی لێکەوت و خەبەری نەبۆوە.. ئیمامی عومەر ﷺ فەرمـووی: ئەگەر نوێژی بەیانی بە جەماعـەت ئەنجام بدەم، لەلام خۆشترە لەوەی کە هەموو شەوەکە بە شەو نوێژ زیندوو بکەمەوە..

❖ عبداللە ی کوڕی قەواریری دەفەرموێت: هەرگیز نەم دەهێشت ئەنجامدانی نوێژی عیشـام بە جەماعەت لە دەسـت بچێت، بەڵام ڕۆژێکیان میوانمان هەبوو، میوانەکە سـەرقاڵی کردم و فریای نوێژی جەماعەتی مزگەوتەکەم نەکەوتم، بە پەلە چـووم بۆ مزگەوتێکی تر بۆ ئەوەی فریای جەماعەت بکەوم، کاتێك چووم، خەڵکی تەواو ببوون و لە مزگەوت دەهاتنە دەرەوە، زۆربەی مزگەوتەکانی شاری (بصـرة) گەڕام، بەڵام فریای هیچیان نەکەوتم، بە دڵشـکاویەوە گەڕامەوەو بیرم لـەوە دەکردەوە کە ئەو پاداشـتە گەورەیـەی نوێژی جەماعەتم لە دەسـتچوو.. کاتێك گەیشـتمەوە ماڵەوە، ڕووم کردە قیبلەو بیست و حەوت جار نوێژی عیشام

٢١-کاسێتی (أنين الفجر) - شيخ نبيل العوضي.

ئەنجامدا، پاشان زۆر بێتاقەت بووم‌و کەمێك ڕاکشام‌و خەوم لێکەوت، لە خەودا بینیم بە سواری ڕام دەکردو دەمویست بگەم بە کۆمەڵێك لە هاوەڵانم، کە ئەوانیش بەسواری لەپێشمەوە ڕایان دەکرد، زیاتر ئەسپەکەم تاو ئەدا، بۆ ئەوەی فریایان بکەوم، بەڵام هەر دوا ئەکەوتم، بۆیە یەکێکیان لای کردەوە بە لامداو پێی وتم: ئەسپەکەت هیلاك مەکە، پێمان ناگەیت، چونکە ئێمە نوێژی عیشامان بە جەماعەت ئەنجامداوە!!

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (أَفضَلُ الصَّلَواتِ عِندَ اللهِ صَلاةُ الصُّبحِ يَومَ الجُمُعَةِ، في الجَماعَةِ)[٣٢]. واتە: (باشترین نوێژ لەلای خودای گەورە، نوێژی بەیانیە لە ڕۆژی هەینیداو بە جەماعەت ئەنجام بدرێ)..

خودای گەورە دەفەرموێت:﴿ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْـَٔاخِرَةَ وَيَرْجُواْ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ...(٩)﴾ الزمر .واتە: (ئایا ئەو جۆرە کەسانەی کە باسکران باشترن) یان ئەو ئیماندارەی کە لە دوو توێی شەوگاردا هەڵدەستێت بۆ خوا پەرستی‌و کڕنوش دەبات‌و بە پێوە دەوەستێت‌و لە لێپرسینەوەی قیامەت دەترسێت‌و ئومێدو هیوای بە میهرەبانی پەروەردگاری هەیە).. هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت:﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ (١٦)﴾ السجدة .واتە: (ئەو ئیماندارە بەختەوەرانە) نێوانیان خۆش نیە لەگەڵ ڕاکشان لە جێگەو ڕێگەی نەرم‌و گەرمدا (واتە: بە نوێژو خوداپەرستی بەشێکی شەو دەبەنە سەر) هەمیشە نزاو پاڕانەوەیان، ڕوو بە پەروەردگاریانەو لە خەشم‌و قین‌و دۆزەخی دەترسن، ئاوات‌و ئومێدی بەهەشت‌و ڕەزامەندی خودایان هەیەو لەو ڕزق‌و ڕۆزی‌و توانایی‌و زانیارییەی پێمان بەخشیون دەبەخشن)..

براوخوشکی موسڵمان: بەڕاستی ئامادەبوون لە نوێژی بەیانی‌و عیشا بە جەماعەت نیعمەتێکی گەورەی خودایە، سەرەتای ڕۆژێکی نوێ بە ملکەچ بوون بۆ فەرمانەکانی خودا دەست پێبکە.. پێغەمبەری خودا ﷺ بەڵێنی داوەو دەفەرموێت: هەرکەس نوێژی بەیانی بە جەماعەت ئەنجام بدات، ئەوا خودای

---

٣٢-صحيح جامع الصغير.

گەورە ئەو ڕۆژە دەیپارێزێت.. هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (مَنْ صَلَّى الفَجْرِ في جَماعَة،ثُمَّ قَعَدَ يَذكُرُ اللهَ حَتَّى تَطْلُع الشَمسَ،ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَين،كانَت لَهُ كَأجر حَجَّة وَعُمْرَة تامَّة تامَّة تامَّة)[٣٣]. واتە:(هەر کەسێك نوێژی بەیانی لە مزگەوتدا بە جەماعەت ئەنجام بدات،پاشان دابنیشێت زیکر و یادی خودای گەورە بکات تا خۆر هەڵدێت،پاشان دوو ڕکات نوێژ بکات،ئەوا پاداشتی حەج و عومرەیەکی تەواو تەواو تەواوی هەیە)..

بەڕاستی ئەوکەسانەی نوێژی بەیانی بە جەماعەت ئەنجام ئەدەن خودای گەورە دڵ و دەروونێکی پاکیان پێ دەبەخشێت، دوور دەبن لە تەمبەڵی و بێتاقەتی و خەم و خەفەت، دەی کەواتە شەویش پێش ئەوەی بچیتە سەر جێگەی خەوتن، نوێژی عیشا بە جەماعەت ئەنجام بدە، دڵنیاش بە خێر و پاداشتی ئەوەت هەیە، کە تا بەیانی شەو نوێژ بکەیت،خودای گەورەش دەفەرموێت:

﴿ وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَعَشِيّٗا وَحِينَ تُظۡهِرُونَ ﴿١٨﴾ ﴾الروم .واتە: (شوکر و سوپاسگوزاری هەر شایستەی زاتی خودایە لە ئاسمان و زەویدا، لەکاتی عیشاو تاریکیدا، هەروەها کاتێك کە نیوەڕۆ دەکەنەوە).

## فەزڵ و پلەو پایەی نوێژە سوننەتەکان

نوێژە سوننەتەکانیش گرنگی و خێر و پاداشتی خۆیان هەیە، وەکو خۆ ئامادەکردنێکیش وان بۆ نوێژە فەرزەکان، یاخود بۆ تەواوکردن و پڕکردنەوەی کەم و کوڕی و ناتەواوی بۆ نوێژە فەرزەکانمان.. پێغەمبەری خوداش ﷺ هانمان دەدات بۆ ئەنجامدانی نوێژە سوننەتەکان، هەروەك دەفەرموێت: (ما مِن عَبد مُسلِم، يُصَلِّي لله تَعالى في كُل يَوم ثنتَي عَشرَةَ رَكعَةً تَطوّعاً، غَيرَ الفَريضة، إلاّ بنَيَ اللهُ لَهُ بَيتاً في الجَنَة- أو إلاّ بُنيَ لَهُ بَيتاً في الجَنَة-)[٣٤]. واتە: (هەربەندەیەکی موسڵمان، هەموو ڕۆژێك جگە لە نوێژە فەرزەکان دوازدە ڕکات نوێژی سوننەت بۆ خودای پەروەردگار ئەنجام بدات، ئەوا خودای گەورە لە بەهەشتدا ماڵێکی بۆ

---

٣٣-صحیح جامع الصغیر ٦٣٤٦ و صحیح الترغیب ٤٦٤.

٣٤-رواه مسلم ٧٢٨.

دروست دەكات- یان ماڵێكی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەكرێت-).. سوننەتیشە ئەم نوێژانە لە ماڵەوە ئەنجام بدرێن، هەروەك پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (أَفضَلُ الصَّلاة، صَلاةُ المَرءِ في بَيتِهِ إلاّ المَكتُوبَة)[٣٥]. واتە: (باشترین نوێژ، ئەو نوێژەیە كە لە ماڵەوە ئەنجام بدرێت جگە لە نوێژە فەرزەكان)..

سوننەتە ڕەواتیبە (مؤكد)ە كانیش دوازدە ڕكاتن، هەروەك پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (مَن صَلَّى في يَومٍ وَلَيلَةٍ إثنَتَي عَشرَةَ رَكعَةً، بُنِيَ لَهُ بَيتاً فِي الجَنَّة، أربَعاً قَبلَ الظُّهر، وَرَكعَتَي بَعدَها، وَرَكعَتَينِ بَعدَ المَغرِب، وَرَكعَتَينِ بَعدَ العِشاء، وَرَكعَتَينِ قَبلَ صَلاةِ الغَداة (الفَجر))[٣٦]. واتە: (هەركەسێك لە شەوو ڕۆژێكدا دوازدە ڕكات نوێژی سوننەت ئەنجام بدات، ماڵێكی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەكرێت، چوار ڕكات پێش نوێژی نیوەڕۆ، دوو ڕكاتیش لە دوای نوێژی نیوەڕۆ، دوو ڕكات لە دوای نوێژی ئێوارە، دوو ڕكات لەدوای نوێژی عیشا، دوو ڕكاتیش پێش نوێژی بەیانی)..

❋ سوننەتی پێش نوێژی بەیانی: نوێژە سوننەتەكانیش هەندێكیان زیاتر پێغەمبەری خودا ﷺ جەختی لەسەر كردونەتەوەو بەردەوام بووە لەسەریان لەوانەش: (دوو ڕكات نوێژی سوننەتی پێش نوێژی بەیانی، سوننەتی وەتر، چوار ڕكات سوننەتی پێش نوێژی نیوەڕۆ)، هەروەك دایكی ئیمانداران عائیشە (خودا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: (أنَّ النَّبيَّ ﷺ لا يَدَعُ أربَعاً قَبلَ الظُّهر، وَرَكعَتَينِ قَبلِ الغَداة)[٣٧]. واتە: (پێغەمبەری خودا ﷺ وازی لە چوار ڕكات سوننەتی پێش نوێژی نیوەڕۆو دوو ڕكات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی نەهێناوە)..

ئەنجامدانی دوو ڕكات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی دەبێتە هۆی بەدەستهێنانی پاداشتێكی گەورە، پێغەمبەری خوداش ﷺ دەفەرموێت: (رَكعَتا الفَجرِ خَيرٌ مِنَ الدُّنيا وَما فِيها)[٣٨]. واتە: (دوو ڕكات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی

---

٣٥-رواه النسائي والطبراني.

٣٦-رواه الترمذي.

٣٧-رواه البخاري ١١٨٢.

٣٨-رواه مسلم ٧٢٥.

چاکترە لە دونیاو لە هەموو ئەو شتانەش کە لە دونیادا هەیە)..

کاتی بەرەبەیان کاتێکی پیرۆزە، هەروەك خودای گەورە سوێندی پێدەخوات و دەفەرموێت ﴿وَٱلْفَجْرِ ۝١﴾ الفجر. واتە: (سوێند بە بەرەبەیان).. لەبەرئەوە پێویستە ئەم کاتە پیرۆزو بەنرخە، لە خودا پەرستی و نوێژ و پارانەوەدا بەکار بهێنین و بە فیرۆی نەدەین، ئەم دوو ڕکاتەش کاتێکی زۆر کەمی دەوێت و سوننەتیشە کە بەکورتی ئەنجام بدرێت، هەروەك دایکی ئیمانداران عائیشە (خودا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: (يُصَلِّي رَكعَتَي الفَجر، فَيُخَفِفُهُما حَتَّى أقُولُ: هَل قَرَأَ فِيهِما بِأُم القُرأن؟!). واتە: (پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەندە بە کورتی سوننەتی پێش نوێژی بەیانی ئەنجام دەدا، هەتا ئەم وت: ئایا دەبێت سورەتی (الفاتحة) ی تێدا خوێندبێت؟!).. سوننەتیشە لە ڕکاتی یەکەمدا سورەتی (الکافرون) و لە ڕکاتی دووەمدا سورەتی (الأخلاص) بخوێنرێت..

❋ **سوننەتەکانی نیوەڕۆ و عەسر:** پێغەمبەری خودا ﷺ ڕێنماییمان دەکات بۆ ئەنجامدانی نوێژە سوننەتەکان لەوانەش: سوننەتی پێش نوێژی نیوەڕۆو دوای نوێژی نیوەڕۆ، هەروەها سوننەتی پێش نوێژی عەسر..

❋ دەربارەی سوننەتی نیوەڕۆ، عبدالله ی کوڕی عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: (صَلَّيتُ مَعَ رَسول ﷺ رَكعَتَينِ قَبلَ الظُهرِ، وَرَكعَتَينِ بَعدَها)[39]. واتە: (لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دوو ڕکات نوێژم کرد لە پێش نوێژی نیوەڕۆ، هەروەها دوو ڕکاتیش لە دوای نوێژی نیوەڕۆ)..

هەروەها دایکی ئیمانداران عائیشە (خودا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: (أَنَ النَبيَ ﷺ كانَ لا يَدَعُ أَربَعاً قَبلَ الظُهر)[40]. واتە: (پێغەمبەری خودا ﷺ وازی لە چوار ڕکات سوننەتی پێش نوێژی نیوەڕۆ نەدەهێنا).

هەروەها دەفەرموێت: (كانَ النَبيُ ﷺ يُصَلي في بَيتي قَبلَ الظُهرِ أَربَعاً، ثُمَ يَخرُجُ فَيُصَلي بالنَاس، ثُمَ يَدخُلُ فَيُصَلي رَكعَتَين، وَكانَ يُصَلي بالنَاسِ المَغرِب، ثُمَ يَدخُلُ بَيتي فَيُصَلي رَكعَتَين، وَيُصَلي بالنَاسِ العِشاء، وَيَدخُلُ بَيتي فَيُصَلي

---

٣٩-متفق عليه.

٤٠-رواه البخاري.

رَكعَتَين)[٤١]. واتە:(پێغەمبەری خودا ﷺ لە ماڵەكەمدا پێش نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕكات نوێژی ئەنجام دەدا، پاشان دەچوو نوێژی نیوەڕۆی بۆ خەڵكی دەكرد، پاشان دەگەڕایەوە بۆ ماڵەكەمو دوو ڕكات سوننەتی ئەنجام دەدا، وە دوای ئەوەی نوێژی ئێـوارەی بۆ خەڵكی دەكـرد، دەهاتەوە بۆ ماڵەكەمو دوو ڕكات سـوننەتی ئەنجام دەدا، وە نوێژی عیشای بۆ خەڵكی دەكردو پاشان دەهاتەوە بۆ ماڵەكەمو دوو ڕكات نوێژی ئەنجام دەدا)..

پێغەمبــەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (مَن حافَظَ عَلَى أَربَعَ رَكعات قَبلَ الظُهرِ، وَأَربَعَ بَعدَها، حَرَمَهُ اللهُ عَلَى النّار)[٤٢]. واتە:(هەر كەسێك پارێزگاری لە چوار ڕكات نوێژی سوننەتی پێش نوێژی نیوەڕۆ و چوار ڕكات نوێژی سوننەتی دوای نوێژی نیوەڕۆ بكات،ئەوا خودا دۆزەخی لەسەر حەرام دەكات)..

✵ لـە بارەی سـوننەتی پێش نوێژی عەسریشـەوە پێغەمبـەری خودا ﷺ دەفەرموێــت: (رَحِمَ اللهُ إمرَءاً صَلَى قَبلَ العَصرِ أَربَعاً)[٤٣]. واتە: (ڕەحمەتو بەزەیی خـودا لەكەسـێك بێت، كە لە پێش نوێژی عەسـردا چوار ڕكات نوێژی سـوننەت ئەنجام دەدات)..

✵ سوننەتی ئێوارەو عیشـا: پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (صَلّوا قَبلَ المَغـرِب). واتە: (لە پێش نوێــژی ئێوارەدا نوێژی سـوننەت ئەنجام بدەن)، پاشان فەرمووی: (لِمَن شاءَ)[٤٤]. واتە: (بۆ كەسێك كە بیەوێتو حەز بكات)..

دایكی ئیمانداران عائیشــە (خـوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێــت: (أَنَ النَبيَ ﷺ كانَ يُصَلّي بَعدَ المَغرِبِ رَكعَتَين)[٤٥]. واتە: (پێغەمبەری خودا ﷺ لەدوای نوێژی ئێوارە، دوو ڕكات سوننەتی ئەنجام دەدا).. ئەنەس (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: (كاتێك لە شاری مەدینە، بانگدەر بانگی ئێوارەی دەدا، خەڵكی دوو ڕكات نوێژی سوننەتی

---

٤١-رواه مسلم.

٤٢-رواه أبو داود والترمذی.

٤٣-رواه أبو داود والترمذي.

٤٤-رواه البخاري ١١٨٣.

٤٥-رواه مسلم.

پێش نوێژی ئێوارەیان دەکرد، ئەگەر ڕێبوارێك بهاتایەتە ناو مزگەوتەکەوە، وای دەزانی نوێژی ئێوارە تەواو بووە، لەبەر زۆری ئەو کەسانەی کە سوننەتی پێش نوێژی ئێوارەیان ئەنجام دەدا)..

❖ دەربارەی سوننەتی عیشاش، عبدالله ی کوڕی عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: (صَلَّيتُ مَعَ النَّبـيَ ﷺ رَكعَتَينِ بَعدَ العشـاء)[٤٦]. واتە: (لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ دوو ڕکات سوننەتی دوای نوێژی عیشام ئەنجامدا)..

وە سوننەتە نوێژە سوننەتەکان لەماڵەوە ئەنجام بدرێن، نەك لە مزگەوت، لەبەرئەوەی ئەنجامدانی نوێژی سوننەت لە ماڵەوە، دوورە لە ڕیا و ڕوپامایی، هەروەها بۆ ئەوەی ماڵەکانمان پیرۆزو پڕ خێر و بەرەکەت بێت، پێغەمبەری خوداش ﷺ دەفەرموێت: (إجعَلوا من صَلاتِكُم في بُيُوتِكُم، وَلا تَتخذُوها قُبُورا)[٤٧]. واتە: (هەندێك لە نوێژەکانتان (نوێژە سوننەتەکان) لە ماڵەوە ئەنجام بدەن و ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان)..

❋ سوننەتی وەتر و چێشتەنگاو (الوتر والضحى): سوننەتی وەتر هۆکارێکە بۆ ڕزگاربوون لە ئاگری دۆزەخ، هەروەها بۆ نزیك بونەوە لە خودای پەروەردگار، هۆکارێکیشە بۆ بەدەستهێنانی خۆشەویستی و بەزەیی پەروەردگار..

کاتی ئەنجامدانی ئەم سوننەتە،لە دوای نوێژی عیشاوە دەست پێدەکات هەتا نوێژی بەیانی، بەڵام باشتر وایە دوا بخرێت بۆ کۆتایی شەوو لە دوای شەو نوێژو لە پێش بانگی بەیانیدا ئەنجام بدرێت، هەروەك پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (إجعَلوا آخرَ صَلاتِكُم بِاللَّيلِ وَترَا)[٤٨] واتە: (کۆتا نوێژی شەوتان با وەتر بێت).. کەمترین ڕکات بۆ نوێژی وەتر بریتیە لە: یەك ڕکات و زۆرترینیشی یازدە ڕکاتە، کەمترین نوێژ لە نێوان نوێژە سوننەتەکاندا نوێژی سوننەتی وەترە، بەڵام پاداشت و خێری لە هەموویان زیاترە، تەنانەت پێغەمبەری خودا

---

٤٦-متفق عليه.

٤٧-متفق عليه.

٤٨-رواه البخاري ٩٩٨ ومسلم ٧٥١.

ﷺ لە کاتی سەفەریشدا وازی لەم نوێژە سوننەتە نەهێناوە.. هەر لەبەرئەوەشە پێویستە لە کۆتایی نوێژەکاندا ئەنجام بدرێت، بۆ ئەوەی مرۆڤەکان بە باشترین نوێژو باشترین کردار کۆتایی بە کردارەکانیان بهێنن..

ئەگەر بە یەکێك بڵێین: بۆچی سوننەتی دوای نوێژی ئێوارە ئەنجام نادەیت؟ ئەویش بڵێت: سوننەتی دوای نوێژی ئێوارە چەند ڕکاتە؟ ئێمەش بڵێین: دوو ڕکاتە.. ئەویش لە وەڵامدا بڵێت: باشە ڕکاتێك ئەنجام دەدەم.. ئێمەش پێی دەڵێین: یان دوو ڕکات ئەنجام بدە، یان ئەو ڕکاتەش ئەنجام مەدە.. بەڵام نوێژی وەتر ئەتوانرێت، تەنها یەك ڕکات ئەنجام بدرێت، جیاواز لەهەموو نوێژە سوننەتەکانی تر، سوننەتیشە سورەتی ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ﴾ی تێدا بخوێنرێت، هەرکەسێکیش ئەم نوێژە ئەنجام بدات، ئەوا لەلای خودای پەروەردگار لە ڕیزی ئەو کەسانەدا دەنوسرێت، کە شەو نوێژیان ئەنجام داوە، خۆ ئەگەر لەباتی ئەو تەنها ڕکاتە، سێ یان پێنج یان حەوت ڕکات ئەنجام بدەیت، ئەوا بە دڵنیاییەوە پاداشتێکی زۆرترت دەست دەکەوێت..

❖ کاتی دەستپێکردنی نوێژی چێشتەنگاویش، دەستپێدەکات لەدوای ڕۆژهەڵاتن بە چارەکە سەعاتێك، یان بەرز بونەوەی خۆر بە ئەندازەی ڕمێك، تا پێش نوێژی نیوەڕۆ، بەڵام وا باشە لە کاتێکدا ئەنجام بدرێت، کە تیشکی خۆر بە تین بووبێت، پێغەمبەری خوداش ﷺ هەرگیز وازی لەم سێ کارە نەهێناوە: (سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بوون، لە هەموو مانگێکدا واتە ڕۆژە سپیەکان(١٣و ١٤و ١٥)ی هەموو مانگێك، هەروەها دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاو، سوننەتی وەتر)..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت هەموو جومگەکانی جەستەی مرۆڤ ڕۆژانە پێویستە خێر و چاکەیەکیان بۆ ئەنجام بدرێت، کە نزیکەی (٣٦٠) جومگە لە جەستەی مرۆڤدا هەیە، بەڵام ئەنجامدانی دوو ڕکات نوێژی چێشتەنگاو جێگەی هەمووی دەگرێتەوەو دەچێتە بری ئەنجامدانی ئەو هەموو خێرو چاکەیە.. کەمترین نوێژی چێشتەنگاویش دوو ڕکاتەو زۆرترینیشی هەشت ڕکاتە.. نوێژی چێشتەنگاو پێی دەوترێت:نوێژی (الأوّابين) واتە: (نوێژی ئەوکەسانەی کە زۆر داوای لێخۆشبوون لە خودای پەروەردگار دەکەن و زۆر بە

زوویش دەگەڕێنەوە بۆ لای)..

✵ سوننەتی (تحیة المسجد)و دەستنوێژ و شەو نوێژ: ئەنجامدانی نوێژە سوننەتەکان، نیشانەی خۆشەویستیە بۆ پەروەردگار، هەروەها پابەندبوونە بە سوننەتەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ..

- پێغەمبەری خودا ﷺ دەربارەی نوێژی سڵاوکردن لە مزگەوت (تَحيَةَ المسجِد) دەفەرموێت: (إذا دَخَلَ أحَدكُم المَسجِدَ، فَلا يَجلِس، حَتى يُصَلّي رَكعَتَين)[٤٩]. واتە: (ئەگەر کەسێکتان چونە مزگەوت دامەنیشن، هەتا دوو ڕکات نوێژ ئەنجام دەدەن).. لەبەرئەوەی پیرۆزترین شوێن لەسەر زەوی لە لای خودای پەروەردگار مزگەوتەکانەو پێویستە کاتێك دەچینە ژورەوە بۆ ناو مزگەوت، ڕێزی لێ بگرین و بە جوانترین کردار، کە نوێژە سلاوی لێ بکەین.

❖ دەربارەی سوننەتی دەستنوێژیش پێغەمبەری خودا ﷺ بە بیلالی فەرموو: (ئەی بیلال، باسی باشترین کردارتم بۆ بکە، کە لە ئیسلامدا ئەنجامت دابێت، چونکە من گوێم لە دەنگی نەعلەکانت بوو لە بەهەشتدا، بیلالیش فەرمووی هیچ کردارێکم ئەنجام نەداوە کە لەلام زۆر باش بێت، ئەوە نەبێت، هەرکاتێك کە دەستنوێژ دەگرم، شەو بێت یان ڕۆژ، دوو ڕکات نوێژی سوننەتی دەستنوێژ ئەنجام دەدەم)..

❖ دەربارەی شەونوێژیش، خودای گەورە وەسفی ئەو ئیماندارانە دەکات کە شەو نوێژ ئەنجام دەدەن، هەر وەك دەفەرموێت: ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ ﴾ السجدة .واتە: (ئەو ئیماندارە بەختەوەرانە) نێوانیان خۆش نیە لەگەڵ ڕاکشان لە جێگەو ڕێگەی نەرم و گەرمدا (واتە: بە نوێژو خوا پەرستی بەشێکی شەو دەبەنە سەر) هەمیشە نزاو پاڕانەوەیان، ڕوو بە پەروەردگاریانەو لە خەشم و قین و دۆزەخی دەترسن، ئاوات و ئومێدی بەهەشت و ڕەزامەندی خودایان هەیەو لەو ڕزق و ڕۆزی و توانایی و زانیاریەی پێمان بەخشیون دەبەخشن)..

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ كَانُوا۟ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ

---

٤٩- متفق عليه.

﴿١٨﴾ الذاريات. واتە: (لەشەودا زۆر کەم ئەخەوتن و ڕاتەکشان، چونکە سەرگەرمی شەو نوێژ و قورئان خوێندن بوون، لە بەرە بەیانەکانیشدا داوای لێخۆش بوونیان لەپەروەردگاریان دەکرد)..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەربارەی عبدالله ی کوڕی عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: (نعمَ الرَجُلُ عَبدُالله، لَو كانَ يُصَلي مِنَ اللَيل)[٥٠]. واتە: (عبدالله پیاوێکی باش دەبوو، ئەگەر شەو نوێژی ئەنجام بدایە)، لە دوای ئەم فەرمودەیە عبدالله ﷺ بەشەودا نەدەخەوت، تەنها کەمێك نەبوایە، هەر خەریکی شەو نوێژ دەبوو.. هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (... صَلّوا باللَيل وَالنَاسُ نيام، تَدخُلوا الجَنَة بِسَلام)[٥١]. واتە: (...کاتێك خەڵکی خەوتوون، ئێوە نوێژ بکەن، ئەوا بە ئارامی و بە سەلامەتی دەچنە بەهەشتەوە)..

خوشك و برای ئیماندار: بزانە کە سەعیدی کوڕی مسەییەب و محمدی کوڕی مونکەدیر و مالیکی کوڕی دینار و ئەبو حەنیفە (ڕەحمەتی خودایان لێبێت) بە دەست نوێژی عیشاوە نوێژی بەیانییان ئەنجام دەدا..

خودای گەورە یارمەتیمان بدات بۆ ئەنجامدانی شەو نوێژ، با دڵنیاش بین، ئەنجامدانی شەو نوێژ ئەوەندە قورس و گران نیە، زۆربەمان لە مانگی ڕەمەزاندا هەموو شەوەکان شەو نوێژ دەکەین، بە دڵنیاییەوە لە دوای مانگی ڕەمەزانیش دەتوانین بەردەوام بین، کەمێکی بەردەوامیش باشترە لە زۆرێکی بڕاوەو کۆتایی پێ هاتوو..

پێغەمبەری خوداش ﷺ دەفەرموێت: (أفضَلُ الصَلاة بَعدَ الفَريضَة: صَلاةُ اللَيل)[٥٢]. واتە: (باشترین نوێژ لە دوای نوێژ فەرزەکان: نوێژی شەو نوێژە).. چونکە کاتی خشوع و پاڕانەوەیە، هەروەها کاتی گریان و لاڵانەوەو پەشیمانی و فرمێسك و ئەسرین ڕشتنە.. ئەو کاتەیە، کە خودای پەروەردگار دێتە ئاسمانی زەوی و بە بەندەکانی دەفەرموێت: (کێ پێویستیەکی هەیە پێی ببەخشم؟ کێ داوای

---

٥٠-متفق عليه.

٥١-رواه أحمد ٢٣٢٧٢ والترمذي ٢٤٨٥ وإبن ماجة ١٣٣٤.

٥٢-رواه مسلم.

لێخۆش بوون دەکات، هەتا لێی خۆش ببم؟)..

❖ إبـن قدامــة لــه کتێبــی (التوابيـن)دا لــه عبدالواحيــدی کـوڕی زەیدەوە دەگێڕێتــەوە کــە فەرمویەتی: له پاپۆڕێکدا بووین، ڕەشــەبا بــەرەو دورگەیەکی بردیــن، لــه دورگەکــەدا پیاوێــك هەبوو بتــی دەپەرســت، پێمــان وت: ئەوە چی دەپەرسـتیت؟! ئامــاژەی بــۆ بتەکــە کــرد.. پێمــان وت: پیاوێکمــان لەگەڵدایــە دەتوانێت هاوشـێوەی ئەم بتە دروست بکات، ئەمە خودا نیە هەتا بپەرسترێت.. پیاوەکە وتی: ئەی ئێوە چی دەپەرسـتن؟! وتمان: (ألله) دەپەرسـتین.. وتی: (ألله) کێیە؟ وتمان: (ألله )ئەو کەســەیە کە عەرشــەکەی لە ئاســمانەو دەســەڵاتدارە بە ســەر هەموو بونەوەردا.. پیاوەکە وتی: چۆن ئەمەتان زانی؟ وتمان: بە هۆی ئەو پێغەمبــەرەوە کە خودا بــۆی ناردبووین.. پیاوەکە وتی: ئــەی پێغەمبەرەکەتان چــی لێهات؟ وتمــان: پەیامەکەی گەیاندو خودا بردیەوە بــۆ لای خۆی.. پیاوەکە وتی: هیچ نیشــانەو بەڵگەیەکی بۆ بەجێ هێشــتوون؟ وتمان: بەڵێ.. قورئانی بۆ بەجێ هێشتووین.. وتی: دەی پیشانم بدەن.. قورئانێکمان بۆ هێناو سورەتێکمان بۆ خوێندەوە.. دەستی کرد بە گریان و وتی: پێویستە سەرپێچی خاوەنی ئەم وتە جوانانە نەکرێت!! پاشــان موســڵمان بوو، بنەماکانی ئیســلام و چەند سورەتێکی قورئانمان فێر کرد.. لەگەڵ خۆمان بردمان بۆ ناو پاپۆڕەکە، کاتێك شــەو داهات کەوتینــە ڕێ و هــەر کەســەمان چووینە جێگــەی خۆمان.. پیاوەکــە پێی وتین: ئەو خودایەی کە پێتان ناســاندم بە شــەو دەخەوێت؟! وتمــان: نەخێر، هەرگیز وەنەوزیــش نــادات.. وتی: دەی ئێــوە کۆمەڵــە بەندەیەکی خراپــن، خوداکەتان ناخەوێــت، کەچــی ئێوە دەخــەون؟! ئەو پیــاوە لە ئێمــە دوور کەوتــەوەو هەر خەریکی شەونوێژ بوو..

کاتێك گەیشــتینەوە شــارەکەی خۆمان، وتمان: ئەم پیــاوە غەریب و نامۆیەو تازەش موســڵمان بــووە، کۆمەڵێك پارەو ســامانمان کۆکــردەوەو پێماندا.. وتی: ئەمە چیە؟! وتمان: پێویستیەکانتی پێ جێبەجێ بکە.. وتی: پاکی و بێگەردی بۆ خودا، من لەو دورگەیەدا بتم دەپەرست، کەچی خودا منی لەبیر نەکرد بوو ئەی ئێســتا کە دەیناسم و دەیپەرســتم چۆن لەبیرم دەکات؟! ئەم پیاوە بوو بە یەکێك

لە گەورە پیاوچاکان[٥٣]..

❖ ئافرەتێك و دوو كوڕەكەی شەویان لە نێوان خۆیاندا دابەش كرد بوو.. هەر یەكەیان سێ یەكی شەو شەونوێژی دەكرد.. كاتێك ئافرەتەكە مرد، دوو براكە هەریەكەیان نیوەی شەو شەونوێژی دەكرد، واتە بەشەكەی دایكیشیان لە نێوان خۆیاندا دابەش كرد.. برایەكیان مرد، براكەی تر شەو تا بەیانی شەونوێژی دەكرد، واتە بەشەكەی دایك و براكەشی بە شەونوێژ زیندوو دەكردەوە، وەكو وەفایەك بۆ دایك و براكەی[٥٤]..

ڕەحمەت و بەزەیی و سەربەرزی دونیاو دوارۆژیش بۆ ئەو كەسانەی كاتێك هەڵدەستن بۆ شەو نوێژ، ئەگەر پیاون خێزانەكانیان خەبەر دەكەنەوە، ئەگەر ئافرەتن هاوسەرەكانیان بەخەبەر دێنن، یاخود خوشك و براكانیان هەڵدەستێنن، یان دۆست و هاوەڵەكانیان بە ئاگا دێنن، كە لەم ڕۆژەدا زۆر ئاسانەو دەتوانرێت لە ڕێگەی مۆبایل و تەلەفۆنەوە یەكتری ئاگادار بكەین..

## چەند چیرۆك و بەسەرهاتێكی ڕاستەقینە

براو خوشكی ئازیز: پێش ئەوەی بڕواداران پێشوازیان لێ بكرێت و بەرەو بەهەشت هەنگاو بنێن، هەروەها پێش ئەوەی تاوانباران بدرێنە پێش و بەرەو دۆزەخ بەڕێ بكرێن، پێش ئەوەی ستەم كاران ببرێن بەرەو هۆڵی ناڵەو هەناسەبڕكێ، هەروەها پێش ئەوەی هەموومان لەبەرامبەر خودای زەوی و ئاسمانەكانەوە ڕابوەستێنرێین، هەروەها پێش تاریكی و تەنیایی ناو گۆڕ، با هەڵوێستەیەك بكەین لە كورتترین كاتدا، نەك هەموو كاتەكان، لەماوەی ساتێك و كاتژمێرێك نەك هەموو ساتەكان، لەو ساتەدا كە مرۆڤ دەچێتە ڕیزی مردووانەوە، ئەوكاتەی كە فریشتەی گیان كێشان هەموو خۆشیەكانی ژیانمان لێ تاڵ دەكات..

بەڵێ.. ئالەم ساتە ناسكەدا پەند وەربگرە، چونكە لەم هەڵوێستانەدا پەندو

٥٣-وما خلقت الجن والإنس إلا ليعبدون/ د. محمد العريفي.

٥٤-مائة قصة من قصص الصالحين/ د. حامد أحمد الطاهر.

ئامۆژگـاری هەیە.. بە هیوای ئەوەی دڵەکان ڕابچڵەکێن.. لێرەدا چەند چیرۆك و بەسـەرهاتێك دەخەینە بەر دیدی ئێوەی ئازیز، خـودای گەورەش دەفەرموێت: ﴿ لَقَدۡ كَانَ فِي قَصَصِهِمۡ عِبۡرَةٞ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِۗ ...﴿١١١﴾ ﴾يوسف .واتە: (بێگومان لەو چیرۆك و بەسـەرهاتانەدا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ خاوەن بیرو هۆشـەکان).. بۆ ئەو کەسـانەی ژیریيان دەخەنــەکارو لەئایەتەکانی خودای پەروەردگار وورد دەبنەوە..

سـەرەتای چیرۆکەکانیش بەم فەرموودەیەی پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەست پـێ دەکەین کە دەفەرموێت: (يُبعَثُ كُلُّ عَبدٍ عَلَـى ما ماتَ عَلَيه)[٥٥]. واتە: (هەموو بەندەکان بەو شێوەیە زیندوو دەکرێنەوە کە لەسەری مردوون)..

❃**چیرۆکی یەکەم**: شێخ (محمد الفراج) لە کاسێتی (تجدید الهمة) دا باسـی کـردووەو دەفەرموێت: یەکێـك لە پیاو چـاکان بۆی گێڕامــەوەو وتی: پیاوێکـی خوداپەرسـتی خەڵکـی (طائف) هات بـۆ (مەککە) و بەرگـی ئیحرامی پۆشـیبوو، لەگەڵ هەندێك لە دۆسـتو برادەرەکانیدا هاتبوون بـۆ ئەنجام دانی فەریزەی حەج، کاتێك گەیشتنە حەرەمی (مەککە) نوێژی عیشا کۆتایی هاتبوو، ئــەو پیــاو چاکە چـووە پێـش هاوڕێکانیو بـوو بە ئیمامیـان، بە جـلو بەرگی ئیحرامــەوەو لەڕێگەی خوداو لەماڵی خوادا دەسـتی کرد بە خوێندنی سـورەتی (الضُحَى) کاتێك گەیشتە ئایەتی: ﴿ وَلَلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لَّكَ مِنَ ٱلۡأُولَىٰ ﴿٤﴾ ﴾الضحى .واتە: (بێگومان قیامەتو دوارۆژ بۆتۆ چاکترە لە ژیانی دونیا).. ئا لەم کاتەدا هەناسەی تەنگ بوو، دووبارە دەسـتی کردەوە بە خوێندنی ئایەتەکان، تا گەیشـتە ئایەتی ﴿ وَلَسَوۡفَ يُعۡطِيكَ رَبُّكَ فَتَرۡضَىٰٓ ﴿٥﴾ ﴾الضحى. واتــە: (لە ئاینــدەدا پەروەردگارت ئەوەندە نازو نیعمەتت پێ دەبەخشـێت، کە زۆر پێی ڕازی دەبیت).. ئالەم کاتەدا بەسەر دەمدا کەوتو گیانی دەرچوو[٥٦]!

❃ **چیرۆکــی دووەم**: شـێخ (ناصـر سـلیمان العمــر) لە ناو دەرســە پیرۆزەکانیدا ئــەم ڕووداوە دەگێڕێتەوەو دەفەرموێــت: یەکێك لە براکانم بۆی

---

٥٥-رواه مسلم.

٥٦-یالیت قومي یعلمون/ عبدالمحسن عبدالرحمن.

گێڕامەوەو وتی: ئامۆزایەکم هەبوو،هەر لە تەمەنی گەنجیەوە بانگ بێژ بوو، هەتا ئەو کاتەی چاوەکانی لەدەستدا، بەڵام هەر لەسەر کارەکەی بەردەوام بوو، پاش ماوەیەك ماڵیان لەو گەڕەکە باری کردو لەمزگەوتەکە دوور کەوتنەوە، بەڵام بەو مەرجەچوو لەگەڵیان و پەیمانی لێوەرگرتن کە هەموو ڕۆژێك پێش نوێژی نیوەڕۆ بیهێنن بۆ مزگەوتەکەو دوای نوێژی عیشا بیبەنەوە بۆ ماڵەوە.. بەم شێوەیە بەردەوام بوو، تاوەکو چەند ساڵێك تێپەڕی، پاشان توشی نەخۆشی بوو بە شێوەیەك کەلە ماڵەوە کەوت..

ڕۆژێك لەو ڕۆژانەی کە نەخۆش بوو، کەمێك هەستی بە لەش سووکی کردو داوای لە منداڵەکانی کرد کە حەز دەکات خۆی بشوات، پاش خۆشۆرین دەست نوێژی گرت و داوای کرد کە بیبەن بۆ مزگەوت، لە مزگەوت بانگی داو پاشان قامەتی کرد بۆ نوێژ.. کاتێك گەیشتە نیوەی قامەتەکە کەوت و گیانی دەرچوو!! ئەزانن بۆ؟! چونکە دڵی بەستراوو وابەستە بوو بە بانگەوازی خوداوە، هەر بۆیە لەناو بانگ و قامەتدا خودای گەورە کۆتایی بە ژیانی هێنا[٥٧]..

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (ثلاثةٌ عَلَى كُثبان المسك يومَ القيامة يَغبطُهُم الأوّلون والآخـرون) وذكر منهم (رَجُلٌ يُنادي بالصّلوات الخَمس كُلَّ يَوم وليلَة)[٥٨]. واتە: (یەکێك لەو سێ کۆمەڵەی کەلە ڕۆژی قیامەتدا، هەموو خەڵکی ئاواتیان پێ دەخوازن، پیاوێکە لەشەوو ڕۆژێکدا پێنج جار بانگ دەدات بۆ نوێژەکان).

❋ **چیرۆکی سێیەم**: (علی کوڕی فضیلی کوڕی عیاض) گەنجێکی دڵپاك و چاو بە فرمێسك بوو، کاتێك باسی بەهەشت، یان دۆزەخیان بۆ دەکرد، یاخود کاتێك باسی مردنیان بۆ دەکرد، دەگریاو هۆن هۆن فرمێسك بە چاویدا دەهاتە خوارەوە..

باوکی ئەم کوڕە ئیمامی یەکێك لە مزگەوتەکان بوو، هەرکاتێك هەستی بکردایە کوڕەکەی لەڕیزی نوێژ خوێنان دایە، بە دەنگی کاریگەرو بە سۆزەوە قورئانی نە ئەخوێند..

---

٥٧- یالیت قومي یعلمون.

٥٨- رواه أحمد والترمذي.

جارێك نەیزانی کوڕەکەی لەڕیزی نوێژ خوێنانداییەو دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی (المؤمنون) هەتا گەیشتە ئەو ئایەتەی کە وەسفی ئەهلی دۆزەخ دەکات‌و دەفەرموێت: ﴿ قَالُوا۟ رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَآلِّينَ ﴿١٠٦﴾ ﴾المؤمنون .واتە: (بە کەساسییەوە دەڵێن: پەروەردگار نەگبەتی‌و نەهامەتی سەرشانی گرتین‌و زاڵ بوو بەسەرمانداو ئێمە کەسانێکی گومڕا بووین).. ئا لەم کاتەدا کوڕەکەی کەوت‌و بورایەوە، باوکی هەستی کردو نوێژەکەی کورت کردەوەو پاش سلاودانەوە، ئاویان ڕژاند بەدەم‌و چاویداو هۆشی هاتەوە..

ڕۆژ هات‌و ڕۆژ ڕۆیی، ماوەیەکی زۆری پێچوو.. جارێکی تر بەهەمان شێوەی جاری پێشوو، باوکی نەیزانی کوڕەکەی لە پشتیەوە نوێژ دەکات‌و دەستی کرد بە خوێندنی سورەتی (الزمر) هەتا گەیشتە ئایەتی:﴿ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمْ يَكُونُوا۟ يَحْتَسِبُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ الزمر. واتە: (لەلایەن خودای گەورەوە سزاو ئازارو ئەشکەنجەی وایان بۆ دەر دەکەوێ کە هەرگیز بەتەمای نەبوون).. ئەم جارەش کوڕەکەی کەوت، بەلام وەکو کەوتنی یەکەم جار نا!! بەڵکو کەوتنی هەتا هەتایی، زۆر هەوڵیان داو ئاویان ڕژاند بە دەم و چاویدا، بەلام سوودی نەبوو، چاوەکانی بۆ هەتاهەتایی لەیەك نا، ئەزانن چی بەسەر هات؟! مرد.. بەڵێ. مرد.. بەلام چۆن مردنێك؟! مردنێك لەکاتی نوێژداو ڕوو بەڕووی پەروەردگار[٥٩]..

*** چیرۆکی چوارەم**: چەند گەنجێکی ئیماندار لەڕۆژی ١٩ ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٤١٢ ی کۆچی، بەنیازی جێبەجێکردنی عومرە کەوتنە ڕێ بەرەو شاری (مەککە) ی پیرۆز..

پاش (١٠) ڕۆژ لە ئەنجامدانی نوێژو ڕۆژوو، پاش دە ڕۆژ لە عیبادەت بۆ پەروەردگاریان، هەروەها بەخشینی خواردن‌و خواردنەوە بەسەر خەڵکانی ڕۆژووگردا، هەروەها دوای بەجێهێنانی نوێژی تەراویح و شەو نوێژ لە کەعبەی پیرۆز، کاتێك گەڕانەوە لەناو سێ ئۆتۆمبیلدا بوون، لە ڕێگە مامۆستاکەیان کە لە ئۆتۆمبیلی سێیەمدا بوو، تەفسیری ئەم ئایەتەی بۆ دەکردن:﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ

٥٩- یا لیت قومي یعلمون.

وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ﴿٦٩﴾النساء. واتــە: (ئەوەی مل کەچی خوداو پێغەمبەر بێت، لەڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ ئەو کەسـانەدا دەبێت کە خودای گەورە نازو نیعمەتی ڕژاندووە بەسـەریاندا، لە پێغەمبەران و ڕاست گۆیان و شەهیدان و پیاو چاکان، ئای کە ئەوانە هاوەڵ و هاوڕێ و هاودەمی چاك و بێ وێنەن)..

لەپـڕ ئۆتۆمبیلێـك کـە بـەرەو ڕوویـان دەهـات خـۆی کێشـا بەیەکێـك لە ئۆتۆمبیلەکانـداو پاشـان لەگـەڵ ئۆتۆمبیلەکانی تـردا لێکیان داو لـە ئەنجام دا شـەش کەسـیان گیانیان لەدەستدا، کە یەکێکیان مامۆسـتاکەیان بوو، دوانیشیان هەموو قورئانیان لەبەر بوو، خودای گەورە لەگەڵ پیاو چاکاندا کۆمان کاتەوە لە دونیاو دوارۆژ دا..

فَحائِل اليَومَ باتَ الحُزنِ يَغمُرُها حُــزناً تُلاطِمُ في الأَنحاءِ يَنتَشرُ

بەڵێ.. ناوچەی (حائل) غەم و پـەژارە دایگرت و گیانی ئەو پیاو چاکانە وەك شەوی میعراج بەرز بوونەوە بۆلای پەروەردگاریان[٦٠]..

ئـای چەند شـیرینە کاتی مردنی پیاو چاکان!! لەوەش خۆشـترو شـیرینتر، دڵنیایی و دوورییە لە ئاگری دۆزەخ.. پاشـان ئەوکاتـەی کە فەرموویان لێئەکرێ بەرەو بەهەشتی نەبڕاوەی هەتا هەتایی و ڕوبارو کانیاوەکانی..

❋ **چیرۆکـــی پێنجەم**: یەکێك لە پزیشـکەکان دەگێڕێتـەوەو دەڵێت: ڕۆژێـك لەکاتی دەوامدا بانگیان کردم بۆ بەشـی فریاکەوتنی خێرا، کاتێك چووم گەنجێکی لێبوو لەسەرە مەرگ دابوو، تەمەنی (١٦-١٧) ساڵ دەبوو..

ئەوانـەی کـە هێنابوویـان بـۆ نەخۆشـخانە، وتیان: لـە مزگـەوت قورئانی دەخوێنـدو چاوەڕێـی قامەتـی نوێـژی بەیانـی دەکـرد، کاتێـك قامـەت کـرا قورئانەکـەی لە جێگەی خـۆی داناو وویسـتی لەڕیزی نوێژکەراندا بوەسـتێت، بەڵام لەهۆش خۆی چوو، ئێمەش هێنامان بۆ ئێرە.. پاش ئەنجام دانی پشـکنین، پزیشـکەکە بـۆی دەرکەوت کە تووشـی (جلطـة) یەك بـووە ئەگەر لە وشـتری بدایە ئەیکوشـت، حاڵەتەکەی زۆر ترسناك بوو،گەنجەکە دەستی برد بۆ دەستی یەکێك لە پزیشـکەکان، پزیشـکەکەش گوێی برد بۆلای دەمی گەنجەکەو چەند ووتەیەکی چرپاند بە گوێی پزیشکەکەداو پاشان وتی:(أشهَدُ أن لاإلهَ إلاّ الله، وَأشهَدُ

---

٦٠-یالیت قومي یعلمون.

أنَ مُحَمَّداً رَسولُ الله) هەر دووبارەی دەکردەوە، هەتا گیانی دەرچوو، پزیشکەکە دەستی کرد بەگریان، سەرمان سوڕما، لەبەر ئەوەی یەکەم جاری نەبوو مردنی نەخۆش ببینێت، کاتێ هێوور بۆوە لێمان پرسی: گەنجەکە چی ووت؟ ئەی چی وای لێکردی بگریت؟! وتی: کاتێك ئێوەم دەبینی زۆر سەرقاڵو هیلاك بوونو هەوڵی چارەسەرتان ئەدا، گەنجەکە چرپاندی بەگوێمدا کە پێتان بڵێم خۆتان هیلاك مەکەن، چونکە سوێند بەخودا من ئەمرم، سوێند بە خودا ئێستا خودای گەورە شوێنەکەمی لە بەهەشتدا هێنایە بەرچاوم... سبحان الله[٦١]!!

❋ **چیرۆکی شەشەم**: بانگ خوێنی یەکێك لە مزگەوتەکان دەگێڕێتەوەو دەڵێت: شەوێکیان زۆر درەنگ گەڕامەوە، چەند ساتێکی زۆر کەمی مابوو بۆ بانگی بەیانی، لەبەر ئەوە یەکسەر چووم بەرەو مزگەوت. کاتێك چوومە ژوورەوە گەنجێکم بینی نوێژی دەکرد، پاش ئەوەی کاتی بانگ هات، بانگم دا، گەنجەکەش هەستا نوێژی سوننەتی پێش نوێژی بەیانی ئەنجامدا، پاشان لەتەنیشتمەوە دانیشت و دەستی کرد بە خوێندنی قورئان.. ئای چەند دەنگی خۆش بوو!! منیش قورئانم دەخوێند، بەڵام ئاگام لە قورئان خوێندنەکەم نەماو هەموو هەستو نەستم لەلای دەنگی ئەو بوو، هیوا خوازبووم کە ئیمامی مزگەوتەکەمان نەیەت، بۆ ئەوەی بەو گەنجە بڵێم پێش نوێژیمان بۆ بکات.. ویستی خودا وابوو ئیمامەکەمان نەهات، منیش فەرمووم لە گەنجەکە کرد بۆئەوەی پێش نوێژیمان بۆ بکات..

گەنجەکە نوێژی دابەست، بە دەنگێکی زۆر خۆش دەستی بە قورئان خوێندن کرد، ئەو ڕۆژە هەینی بوو، لەبەر ئەوە لە ڕکاتی یەکەمدا سورەتی (السَجدةَ) ی خوێند، بەڵام لە ڕکاتی دووەم دا زۆر بەخێرایی سورەتی (الفاتحة) ی خوێند، گومانم وابوو سورەتی (الإنسان) بخوێنێ چونکە سوننەتە لە بەیانی ڕۆژی هەینی دا سورەتی (السجدة) و (الإنسان) بخوێنرێت، بەڵام گەنجەکە سورەتی (الإخلاص) ی خوێندو زۆر بە خێرایی نوێژەکەی تەواو کردوو سڵاوی دایەوە، کاتێك ڕووی وەرگێڕا بینیمان دەستی گرتووە بە سەر یەوە، چووین بۆلای و

---

٦١-دفنوها وهي ساجدة/ أبو عبدالرحمن.

پێمان وت: ئەوە چیتە؟ لەتاو ئازاری سەری کەوت، خەڵکی لەدەوری کۆبوونەوە، گەنجەکە زەردەخەنە کەوتە سەر لێوی و وا گومانمان برد کە ئازارەکەی سەری نەماوە،پێم وت: ئەوە چیتە؟ بۆ وات لێهات؟ بەڵام جوڵەی نەکرد، یەکسەر بردمان بۆ نەخۆشخانەو پزیشکەکان دڵنیایان کردین کە گیانی سپاردووە[62]..

* **چیرۆکی حەوتەم:** ئەبووایە لە کاتی خۆیدا لە لای هاوەڵەکانم ئامادەبوومایە، کە بڕیار بوو هەمووومان بەیەکەوە ئەو شەوە بە سەر بەرین، بەڵام بە هۆی قەرەباڵغی ڕێگەوبانەوە دواکەوتمو کاتێك چووم بۆ ئەو شوێنە هاوەڵەکانم لەوێ نەمابوونو ڕۆیشتبوون.. خۆزگە دەمزانی چوون بۆ کوێ.. بڕیارمدا بگەڕێمەوەو ئەمشەوو لە ماڵەوە بە سەر بەرم.. کچە تاقانەکەشم نەخۆشەو پێویستە لە نزیکی بم.. لەبەردەم دوکانێکی ڤیدیۆییدا ڕاوەستامو چەند فیلمێکم کڕیو گەڕامەوە بۆ ماڵەوەو بانگی خێزانەکەمم کرد، کە چاو چەرەساتم بۆ ئامادە بکات.. ئای ئەم خێزانەم چەند وشکە!! ئێستا دەڵێت: لە خودا بترسە ئەحمەد.. هاتە ژوورەوە بۆ لامو چاو چەرەساتی بۆ هێنامو بە زەردەخەنەوە پێی وتم: ئەڵێی لە هاوەڵەکانت بێزار بوویتو دەتەوێت ئەمشەو لە لامان بمێنیتەوە؟! وتم: بەڵێ.. وەرە دانیشە.. منیش چووم تەلەفزیۆنو ڤیدیۆکەم هەڵکردو دەنگی مۆسیقاو هاوارو پێکەنین لە ژوورەکەدا بەرزبۆوە.. خێزانەکەم سەری ژانی دەکردو وتی: لە خودا بترسە ئەحمەد، پاشان چووە دەرەوە.. منیش چاو چەرەسم دەخواردو چاوم لە سەر شاشەی تەلەفزیۆنەکە لانەدەبردو کاسێتی یەکەمو دووەمم تەواو کرد..

کاتژمێر لە سێی شەو تێپەڕی بوو، لە پڕ دەرگای ژوورەکەم بە هێواشی کرایەوە.. هاوارم کرد چیت دەوێت؟! کەس وەڵامی نەدایەوە!! دەرگاکە کرایەوەو کچە بچوکە نەخۆشەکەم هاتە ژوورەوە.. سەرم سوڕماو هیچ قسەم نەکرد، هاتە نزیکمو بە لە سەر خۆییەوە سەیری دەکردمو پاشان وتی: باوکە لە خودا بترسە.. باوکە لە خودا بترسە.. پاشان گەڕایەوەو دەرگاکەی داخست.. بانگم کرد: سارە.. سارە.. وەڵامی نەدامەوەو چووم بە دوایدا سەیرەکەم دەستی کردۆتە ملی دایکیو

---

٦٢-في بطن الحوت/ د. محمد العريفي.

خەوتووە..

گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم‌و تەلەفزیۆن‌و ڤیدیۆکەم کوژاندەوە.. دەنگی باوکە لە خودا بترسەی کچەکەم هەموو ژوورەکەمی پڕ کرد بوو.. مووچڕکەیەك بە لەشمدا هات‌و جەستەم ئارەقی کرد.. نازانم چیم بە سەرهات.. دەنگی کچەکەم لە گوێمدا دەزرنگایەوە.. وێنەی هەر لە بەر چاوم بوو.. وشەکانی هەموو بەربەستەکانی دەرونی شکاندم لە (نوێژ نەکردن- تاوان- جگەرە خواردن- فیلمی بێئابڕوو) لە خەوی بێئاگای بێداری کردمەوە.. دڵم بە خێرایی لێیدەدا.. خۆم فڕێدایە سەر زەوی‌و ویستم بخەوم بەڵام نەمتوانی.. دەنگی باوکە لە خودا بترسەی کچەکەم لە گوێچکەمدا دەزرنگایەوەو لەم کاتەدا دەنگی بانگی بەیانی بەرز بۆوە.. بانگەکە گەیشتە (الصلاة خير من النوم).. بەڵێ.. نوێژ باشترە لە خەو.. ئاهـ.. ئەم هەموو ساڵە من لە غەفڵەت‌و بێئاگایدا بووم، دەست نوێژم گرت‌و بەرەو مزگەوت کەوتمە ڕێ، چوومە مزگەوت‌و دوو ڕکات نوێژم کردو پاشان دەستم بە قورئان خوێندن کرد.. هەستم کرد قورئانەکە گلەییم لێدەکات‌و پێم دەڵێت: ئەم هەموو ساڵە بۆ پشتت تێکردم‌و فەرامۆشت کردم.. ئەی من وتەی خودای پەروەردگارت نەبووم؟! چەند جارێك ئەم ئایەتەی سورەتی (الزمر)م خوێندەوە، کە دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾﴾ الزمر. واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ، خودا دەفەرموێت: ئەی بەندەکانم، ئەوانەی کە خۆتان گوناهبار کردووەو هەڵەتان زۆرە، نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خودا، چونکە بە ڕاستی ئەگەر ئێوە تەوبەی ڕاست‌و دروست بکەن، خودا لە هەموو گوناهـ‌و تاوانەکانتان خۆش دەبێت، چونکە بێگومان ئەو خودایە زۆر لێخۆشبوو لێبوردەیەو زۆریش بەسۆزو میهرەبانە)..

سەیرە!! خودا چەندە بە بەزەییە.. حەزم دەکرد لە قورئان خوێندن بەردەوام بم، بەڵام قامەت بۆ نوێژ کرا، منیش ڕەق ڕاوەستا بووم، پاشان چوومە ڕیزەوەو وەکو کەسێکی نامۆ وابووم.. لە دوای نوێژ تا خۆر هەڵهات لە مزگەوت مامەوە، پاشان گەڕامەوە بۆ ماڵەوەو سارەو خێزانەکەمم بینی خەوتبوون..

چـووم بۆ سـەر کارەکەم، هەرچەندە ڕەوشـتی من نەبـوو بەیانیان زوو بچم بۆ سـەر کارەکەم.. هاوڕێکانم کاتێك بینیمیان سـەریان سـوڕما، هەندێك وشەی گاڵتەجارییـان پێوتم، منیش گوێـم لێنەگرتن وچاوەڕێـی ئیبراهیمی هاوڕێمم دەکـرد، کە لـە ماوەی ئەم چەند سـاڵەدا ئامۆژگـاری دەکـردم.. ئیبراهیم هات و منیش بەرەو ڕووی چووم و باسـی شـەوی ڕابـوردووم بۆ گێڕایـەوەو چاوەکانی پڕ لە فرمێسـك بوون.. بـە زەردەخەنەوە پێـی وتم: ئەو ڕوناکیەی دڵی ڕۆشـن کردوویەتەوە، بە تاریکی گوناهـو تاوان مەیکوژێنەرەوە..

هەر چەندە شـەوی ڕابوردوو نەخەوتبووم، بەڵام هەسـتم بە چالاکی و لەش سووکیەکی زۆر دەکرد.. ئیبراهیم پێی وتم: ئەحمەد دوێنێ شەو نەخەوتوویت، پێویسـتە بگەڕێیتـەوە بۆ ماڵـەوەو من کارەکانی تـۆش ئەنجـام دەدەم.. چەند خولەکێکـی مابـوو بۆ بانگـی نیـوەڕۆو بڕیارمـدا بمێنمـەوەو کاتێـك بانگیدا بـە خێرایی چووم بـۆ مزگەوت و لە ڕیـزی یەکەمدا نوێژم کرد.. لـە دوای نوێژ گەڕامەوە بۆ ماڵەوەو لە ڕێگا هەستم بە دڵە ڕاوکێیەکی زۆر دەکرد.. ئەبێت سارە حاڵی چۆن بێت؟! سـەرم بۆ ئاسـمان بەرز کردەوەو لە خودا پاڕامەوە کەشـیفای سارە بدات.. هەسـتم دەکرد ڕێگای ماڵەوە زۆر دوورو درێژە.. گەیشتمە ماڵەوەو بانگـی خێزانەکەم کردو وەڵامی نەبوو.. چوومە ژوورەوە سـەیر دەکەم سـەری داخسـتووەو دەگری.. وتی: سـارە مرد.. سـارە مرد.. بەرەو لای سارە ڕامکردو لە باوەشم گرت، دەستەکانی بەرەو خوارەوە شل بوونەوە.. دەست و قاچەکانی سارد ببوونەوە.. دەم و چاوی وەك مانگ دەدرەوشـایەوە، بـاوەڕم نەدەکرد کە مردووە، دەمجوڵانـدو لێوە بچووکەکانیم ماچ دەکرد.. دەگریـام.. وامدەزانی پێم دەڵێت: باوکـە عەیبـە مەگـری.. ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ﴾.. تەلەفونـم بـۆ ئیبراهیـم کردو پێـم وت: وەرە بۆ ئێرە سـارە مـردووە.. ئافرەتەکان لەگـەڵ خێزانەکەمدا خەریکی شـۆرینی سارە بوون و بە خامێکی جوانی سپی دایانپۆشی.. خێزانەکەم بانگـی کـردم، بـۆ ئـەوەی ماڵئاوایی لە سـارە بکـەم، خەریك بوو بکەومە سـەر زەوی، ڕوومەتەکانیـم مـاچ کردو بەڵێنم پێدا هەتا مردن خۆڕاگر بم.. سـەیری خێزانەکەمم کردو پێم وت: سـارە چوو بۆ بەهەشـت و إن شـاءالله لە بەهەشـتدا

بە یەك دەگەینەوە.. نوێژمان لە سەر کرد و بەرەو گۆڕستانمان برد.. سەیری جەستەیم دەکرد کە پڕ بوو لە ڕوناکی.. ئەو ڕوناکیەی کە هەموو ژیانی ڕۆشن کردمەوە.. گۆڕستان زۆر ترسناك و چۆڵ بوو.. ئای دەبێت کچەکەم لێرەدا بەجێ بهێڵم؟! لەم کاتەدا ئیبراهیمی هاوڕێم شانی گرتم و وتی: ئارام بگرە.. دابەزیمە ناو گۆڕەکەوە.. ئەمەش شوێنەکەتە ئەحمەد، چیت ئامادە کردووە بۆ ئەم جێگەیە؟! ئیبراهیم وتی: کچەکەت بگرە.. خستمە سەر سنگم و حەزم دەکرد لە ناخمدا بینێژم.. ماچم کرد و پاشان لە لای ڕاست دامنا و جوان داپۆشی و هاتمە دەرەوە.. خەڵکەکە دایاندەپۆشی، منیش هۆن هۆن فرمێسك لە چاوەکانم دەهاتنە خوارەوە..

سوپاس بۆ ئەو خودایەی بە هۆی کچە پاك و بێتاوانەکەمەوە ڕوناکی ئیمانی پێ بەخشیم و ڕێگەی ڕاستی پێ نیشاندام[٦٣]..

* **چیرۆکی هەشتەم**: شێخ عادل سالم الکلبانی دەگێڕێتەوەو دەڵێت: بە تەواوی گومڕا نەبووم، بەڵام کەسێك بەرەو نوێژ و خوداپەرستی هانی نەدام و خۆشم پەیوەندیم بە هیچ خولێکی قورئان لەبەرکردنەوە نەکرد.. منداڵیم لەگەڵ یاری و تەلەفزیۆندا بە سەر برد، زۆر هۆگری ئۆتومبیل بووم.. دوای تەواو بوونی قوتابخانە و شەوانیش خەریکی سەیری تەلەفزیۆن و گەشت و گەڕان بووم.. سەرەتای خوداناسینم لەو ڕۆژەوە بوو، کە هەستام بە گەیاندنی باوکم بۆ ئەوەی سەردانی هاوڕێیەکی بکات.. لە سەیارەکەدا چاوەڕێی هاتنە دەرەوەی باوکم دەکرد و ڕادیۆکەم دەگۆڕی.. بە قەدەری خودا چووە سەر ڕادیۆی دەنگی قورئانی پیرۆز، بە دەنگێکی بەسۆز و خرۆشەوە قورئانی دەخوێند.. کاریگەریەکی زۆر بەهێزی کردە سەر دڵ و دەرونم، لەبەرئەوەی یەکەم جارم بوو گوێم لەم ئایەتە بێت کە دەفەرموێت: ﴿ وَجَآءَتْ سَكْرَةُ ٱلْمَوْتِ بِٱلْحَقِّ ۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ ﴿١٩﴾ ﴾ق. واتە: (ئەی ئینسان، ناڕەحەتیەکانی مردن و ئازارەکانی هات، هاوڕێ لەگەڵ ڕاستیەکاندا، ئەوسا پێت دەوترێت: ئا ئەوە ئەو بەسەرهات و ڕوداوەیە کە خۆتت لێ لادەداو پەنات لێدەگرت).. دەنگەکەش دەنگی شێخ

---

٦٣-في بطن الحوت.

محمد صديق المنشاوی بوو (خودا لێی خۆش بێت).. دەنگەکە زۆر کاریگەر بوو، ڕاستە یەکسەر هیدایەتم وەرنەگرت، بەڵام یەکەم هەنگاوی هیدایەتدانم بوو.. ئەو ساڵە ساڵی مردن بوو، زۆرێك لە سیاسەتمەداران و گۆرانی بێژ و پیاوە گەورەکانی جیهان مردن.. سێبەری مەرگ هەمیشە لەگەڵمدا بوو، هەتا خەریك بوو شێت دەبووم.. لە خەودا دەترسام و بەڵکو خەو لە چاومدا تۆرا بوو.. دوعام دەکرد و زیکرەکانم دەخوێند، کەچی خەو نەدەچووە چاوم.. دەستم کرد بە نوێژ کردن و بە جەماعەت نوێژەکانم ئەنجام دەدا.. سارد و سڕیم تێدا بوو، بەڵام لە ترسی مردن نەمدەتوانی واز لە نوێژەکانم بهێنم.. چۆن لە مردن ڕابکەم؟! چۆن لە گۆڕدا بە تەنها بم؟! بیرم لە ڕۆژی دوایی دەکردەوە.. بیرم لە ﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلۡبُرُوجِ ﴾ و ﴿ وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا ﴾ و ﴿ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا تَلَىٰهَا ﴾ دەکردەوە..هاتمە سەر ئەو باوەڕەی کە هیچ پەنایەك نیە، تەنها پەنای خودا نەبێت و مردنیش بێ هیچ گومانێك هەر دێت.. خۆم ئامادەکرد و قورئانم خۆشویست، کاتێك گوێم لەو ئایەتانە دەبوو کە پێشنوێژ دەیخوێند، یەکسەر دەچوومەوە بۆ ماڵەوە و لەبەرم دەکردن، پاشان لە یەکێك لە مزگەوتەکاندا بە پێشنوێژ دامەزرام و نوێژی تەراویحم بۆ خەڵکی دەکرد و قورئانم دادەناو لەبەر قورئانەکە پێشنوێژیم بۆ خەڵکی دەکرد.. لە دوای مانگی ڕەمەزان پەیمانمدا بە خودا، کە قورئان لەبەر بکەم و لە ساڵی داهاتوودا بەبێ سەیرکردنی قورئان پێشنوێژی بکەم.. سوپاس بۆ خودا لە ماوەی ساڵێك و چەند مانگێكدا قورئانی پیرۆزم لەبەرکرد، پاشانیش لە مزگەوتی (مەلیك خالید) لە شاری ڕیاز دامەزرام..

لە مانگی ڕەمەزاندا مزگەوتەکەی لێوان لێو دەبێت لە نوێژخوێنان و لە هەموو لایەکەوە موسڵمانان دێن بۆ ئەوەی گوێیان لە دەنگە کاریگەر و بەسۆز و خۆشەکەی بێت.. ئەو دەنگەی کاتێك کە سورەتی (الحشر) و (القيامة) و (الحاقة) دەخوێنێت، وەك ئەوە وایە بە چاوەکانی دۆزەخ و مردن ببینێت!!

شێخ عادل دەفەرموێت: من بەندەیەکی زۆر ڕەش پێستم و ئەگەر فەزڵی خودای گەورە و پاشان قورئانە پیرۆزەکەی نەبووایە، کەی ئەوەندە لە لای خەڵکی ڕێزدار و خۆشەویست دەبووم.. شایانی باسە شێخ عادل الكلبانی بۆ یەکەم جار لە

ڕەمەزانی ساڵی ١٤٢٩ی کۆچی لە حەرەمی مەککەی پیرۆز، بە دەنگە بە سۆزەکەی پێش نوێژی بۆ ملیۆنەها نوێژخوێنان کرد و ئێستاش یەکێکە لە پێش نوێژەکانی حەرەمی مەککەی پیرۆز[٦٤]..

* **چیرۆکی نۆیەم**: پیاوێکی خواناسی کوردی خەڵکی شاری سلێمانی، یاریدەدەری پزیشکی بوو، بە دکتۆر بەکر ناسرا بوو.. خودای پەروەردگار سەفەری ماڵە پیرۆزەکەی خۆی پێبەخشی و لە سێیەم ڕۆژی جەژنی قوربانی پیرۆزدا کە دەیکردە ١٢ی ذي الحجـةی ١٤٢٩ی کۆچی بەرامبەر ٩ی ١٢ی ٢٠٠٨ی زاینی، گیانی سپارد!! بەڵام چۆن گیان سپاردنێك و لە چ شوێنێکدا؟!

لە دوای تەواو بوونی میوانانی ماڵی خودا لە ئەرك و فەرمان و مەراسیمی حەج و هاتنەوەیان لە میناوە بۆ شاری مەککەی پیرۆز.. لە دوای هیلاکی و ماندوو بوون و گەرمایەکی زۆر.. دوای خۆشۆرین و کەمێك حەسانەوە، هەروەها لەبەرئەوەی حاجیەکان لەم کاتەدا زۆر هیلاك و ماندوون و خەڵکانێکی زۆر ئەو ڕۆژە ناچن بۆ حەرەمی پیرۆز و لە مزگەوتەکانی نزیك شوێنی نیشتەجێ بوونیان نوێژەکانیان ئەنجام دەدەن.. دکتۆر بەکریش بۆ نوێژی مەغریب دەچێت بۆ یەکێك لەو مزگەوتانە و لە ناو نوێژەکەدا دەکەوێت و گیانی پاکی دەسپێرێت!!

خۆزگەمان بە خۆی!! لە دوای پاك بوونەوەی لە گوناه و تاوان.. لە دوای بەجێ هێنانی فەریزەی حەج و عەمرە.. لە ناو نوێژداو لە پیرۆزترین شوێنی سەر زەویداو لە شاری مەککەی پیرۆز گیانی پاکی سپارد.. لە حەرەمی پیرۆزی مەککەش بە ملیۆنەها لە موسڵمانانی جیهان نوێژی جەنازەیان لە سەر کرد و پاشانیش بە خاکیان سپارد.. خودای گەورە بە بەهەشتی بەرینی شاد بکات..

* **چیرۆکی دەیەم**: پیاوێك لە دوورەوە دەرکەوت، کەسێك بوو جلی ئیحرامی لەبەردا نەبوو، وەك ئەوەی تەنها هاتبێت بۆ نوێژ.. بەرەو ناوچەیەکی دوور لە کەعبەی پیرۆز ڕۆیشت و لەوێ دانیشت.. دوای کەمێك کۆمەڵە کەسێك، کە ئافرەتێکیان تێدابوو هاتن بۆ هەمان ئەو شوێنەی کە پیاوەکەی لێ دانیشت

---

٦٤-تبت إلى الله/ يوسف الحاج أحمد.

بـووو.. ئافرەتەكەیـان لە نـزیـك پیاوەكە بەجێ هێشـت، ئەم ئافرەتـەو پیاوەكە زۆر لەیەكتـر نزیك بوون.. كاتێك كە قامەت بۆ نوێژ كرا، ئەم دوو كەسـە لەگەڵ خەڵكەكە هەڵنەسـتان بۆ نوێژ، بەڵام بۆچی ئەو كەسـانەی كە لە نزیكیان بوون، هەروەها بەرپرسـانی حەرەم ڕێگەیان پێدان لە كاتێكدا كە خەڵكی نوێژ دەكەن، ئەمان دابنیشن؟! زۆر پرسیار بە خەیاڵمدا هاتن و چوون.. پرسیارم لە خۆم كرد، ئایـا دەبێت ئەو پیاوە هەسـتی چۆن بێـت، لە كاتێكدا كە خەڵكـی نوێژ دەكەن و ئەمیش لە تەنیشت ئافرەتێكەوە لە حەرەمی مەككەدا دانیشتووە؟! وەڵامەكەش بریتی بوو لە یەك وشە، ئەویش بریتی بوو لە مردن!!﴿ كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ﴾ .. بەڵـێ.. هەردووكیان گیانیان سـپارد بـوو.. ئەم دیمەنە جێگەی سەرسـوڕمان نەبوو، لەبەرئەوەی هاوشـێوەی ئـەم دیمەنە لە حەرەمدا زۆر دوبـارە دەبۆوە.. الصـلاة على الأمـوات يرحمكـم الله.. پێـش نوێژ( الله أكبـر)ی كرد و دەسـتی بە خوێندنی سـورەتی (الفاتحة) كـرد.. (الله أكبر).. أللهم صل علـى محمد وعلى آل محمـد، كمـا صليت على إبراهيم وعلـى آل إبراهيم.. (الله أكبـر).. أللهم اغفر لهما وارحمهما....( الله أكبر).. السلام عليكم ورحمة الله وبركاته[٦٥]..

***چیرۆكی پانزەیەم**: شۆفێری ئیسعاف بووم و كەسێكی زۆر دڵ ڕەق بووم.. ئامادەی بینینی زۆر كارەسـاتی دڵتەزێن بـووم، بەڵام پەندو ئامۆژگاریم لێوەرنەدەگرت، تەنانەت نوێژیشـم نەدەكرد.. شـەوێك نزیكـەی كاتژمێر یەك پەیوەندیـان پێـوە كردم كە ڕووداوێك ڕوویداوەو پێویسـتە ئامادە بم.. سـواری ئیسعافەكە بووم و بەپەلە بەرەو شوێنی ڕووداوەكە كەوتمە ڕێ.. كاتێك گەیشتمە شـوێنی ڕووداوەكە، دەبینم ئوتومبیلێك خۆی كێشـاوە بە عەمودێكی كارەباداو ئەم ڕووداوەش ببووە هۆی پچڕانی تەزووی كارەبا لەو ناوچەیەدا..

بـەرەو دەرگای ئوتومبیلەكە ڕۆیشـتم و جگەرەیەكیشـم بە دەسـتەوە بوو.. دیمەنێكـی سـەیرم بینی!! پیاوێك ڕیشـێكی جوانـی هەبوو، نـوری دەم و چاوی ئوتومبیلەكـەی ڕونـاك كردبـۆوە.. ویسـتم یارمەتـی بـدەم و لـە ئوتومبیلەكە دەری بهێنم.. پیاوەكە سـەیری كـردم و وتی: دەتەوێـت یارمەتیم بدەیت؟ وتم:

---

٦٥-دموع المحراب.

بەڵـێ.. وتی: بـە یارمەتیـت جگەرەکـەت بکوژێنــەرەوە.. لە دڵی خۆمـدا وتم: لەوانەیە کارەسـاتەکە کاری تێکرد بێتو زۆر ئاگای لە خۆی نەبێت.. جگەرەکەم کوژاندەوەو کاتێك ویستم یارمەتی بدەم، پێی وتم: دەتەوێت یارمەتیم بدەیتو ڕزگارم بکەیت؟ وتم: بەڵێ.. وتی: دەمەوێت لە سەر ئەم یارمەتیدانەت پاداشتت بدەمـەوەو ئامۆژگاریـت بکەم.. وتـم: فەرموو.. وتـی: ملکەچـی فەرمانەکانی خـودای پەروەردگارت بکە، هەروەها ڕێزی دایـكو باوکت بگرەو یارمەتیان بدە، هاوڕێیەتی کەسـانی خراپیش مەکە.. پاشـان وتی: أشهد أن لاإله إلا الله وأن محمداً رسـول الله.. پاشان گیانی سـپارد.. بردم بۆ نەخۆشـخانەو گەڕامەوە بۆ ماڵەوەو ویستم بخەوم، بەڵام نەمتوانی، لەبەرئەوەی هەر بیرم لەو دیمەنە دەکردەوە کە بینی بووم، هەروەهـا بیرم لە ئامۆژگاریە جوانەکانی دەکـردەوە.. دەنگی بانگی بەیانـی لـە مزگەوتەکانەوە بـەرز بۆوە.. دەسـت نوێژم گرتو بـەرەو مزگەوت کەوتمە ڕێ، بۆ ئەوەی بە جەماعەت نوێژی بەیانی ئەنجام بدەم، ئەمەش یەکەم جارم بوو کە بەرەو مزگەوت بچم..

خـودای گـەورە پاداشـتی ئـەو پیـاوە ئیمانـدارە بداتـەوە کـە بـووە هـۆی هیدایەتدانم.. ﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهْدِيَهُۥ يَشْرَحْ صَدْرَهُۥ لِلْإِسْلَٰمِ ۖ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُۥ يَجْعَلْ صَدْرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِى ٱلسَّمَآءِ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٢٥﴾﴾الانعام. واتە: (ئەو کەسەی کە خودا بیەوێت هیدایەتی بدات، ئەوە سـینەی سـافو پاكو ئامادە دەکات بۆ ئاینی ئیسـلام، ئەو کەسـەش خودا بیەوێت گومڕای بکات، ئەوە دڵی دەگوشێتو سنگی توند دەکاتو هەناسـەی سـوار دەبێت، هـەر وەك ئـەوەی بەرەو ئاسـمان بەرز بێتـەوە (چۆن توشی تەنگەنەفەسـیو دڵەتەپێو خوێن بەربوون دەبێت)، ئا بەو شێوەیە خودا گومڕاییو پیسی هاوەڵگەری لە سەر دڵی ئەوانە دادەنێت کە باوەڕ ناهێنن)[٦٦]..

❋ **چیرۆکـی دوانزەیـەم**: پێـش چەنـد سـاڵێك لەمەوبـەر، لـە مزگەوتەکـەی پێغەمبـەری خـودا ﷺ پیاوێکـی نەخوێنـدەواری بـە ڕەگـەز یەمەنـی هەبوو، ئەم پیاوە هـەر کاتێك بهاتایە بۆ مزگەوتو کەسـێکی ببینیایە

---

٦٦-انقذوني/ أبو عبدالرحمن.

کە دانیشتووەو سەرقاڵ نیە، قورئانێکی دەدایە دەست و پێی دەوت: قورئانم بۆ بخوێنە.. ئەو کەسە قورئانی بۆ دەخوێندو ئەمیش گوێی دەگرت.. ئەم پیاوە ئیماندارە زۆربەی تەمەنی بەم شێوەیە بە سەر برد بوو..

ڕۆژێك ئەم پیاوە وەکو هەموو جارێك دەچێت بۆ مزگەوتەکەی پێغەمبەر ﷺ و قورئانێك دەداتە دەستی پیاوێك، بۆئەوەی قورئانی بۆ بخوێنێت و ئەمیش گوێی لێبگرێت.. ئەو پیاوەی قورئانەکەی بۆ دەخوێند، گەیشتە ئایەتێك کە (سجدة)ی تێدابوو، هەردووکیان سوجدەیان برد.. قورئانخوێنەکە سەری بەرز کردەوەو هەستایەوە، بەڵام پیاوە ئیماندارەکە هەڵنەستایەوە، لەبەرئەوەی خودای پەروەردگار لە کاتی سوجدە بردنەکەیداو لە مزگەوتەکەی پێغەمبەر ﷺ داو لە شاری مەدینەی پیرۆز گیانی پاکی کێشا.. بە ڕاستی لە کاتێکدا گیانی سپارد، کە نزیکترین کاتی بەندەیە لە خودای پەروەردگارەوە[٦٧]..

❋ **چیرۆکی سیانزەیەم**: منداڵێکی تەمەن (٧-٨) ساڵ لەگەڵ باوکیدا ئامادەی کۆڕێك دەبێت، لە کۆڕەکەدا منداڵەکە گوێی لەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەبێت کە دەفەرموێت: (مَن صَلَى الصُبحِ في الجَماعَة فَهوَ في ذِمَة الله).[٦٨] واتە: (هەرکەسێك نوێژی بەیانی بە جەماعەت ئەنجام بدات، ئەوا لە پارێزگاری خوادا دەبێت).

لەدوای کۆڕو دانیشتنەکە، منداڵەکە بە باوکی دەڵێت: بابە، بەیانی بۆ نوێژی جەماعەت هەڵمسێنە. باوکیشی وا دەزانێت منداڵەکە تەنها ئێستا دڵی گەرمە و بەیانی لەبیری دەچێتەوە، بۆیە بە کوڕەکەی دەڵێت: باشە إن شاءالله.. منداڵەکە دەڵێت: ئەگەر هەڵم نەسێنی، ناچم بۆ قوتابخانە..

بەیانی باوکی بەتەنها دەچێت بۆ مزگەوت و هەڵی ناسێنێ.. منداڵەکەش دەڵێت: لەبەر ئەوەی هەڵت نەساندم ناچم بۆ قوتابخانە.. باوکی زۆر هەوڵی لەگەڵ ئەدات، کە بچێت بۆ قوتابخانە، چونکە وانەکانی دەفەوتێت، بەڵام بێ سوود ئەبێت..

---

٦٧-دموع المحراب.

٦٨-رواه مسلم ٦٥٧.

بـۆ ڕۆژی دوایـی باوکەکـە منداڵەکـەی خەبەر دەکاتـەوە، لەبەر ئـەوەی لە قوتابخانـە دوا نەکەوێـت و خوێندنەکـەی نەفەوتێـت.. منداڵەکـە بەدڵێکـی خۆشـەوە دەچێت بۆ مزگەوت و نوێژەکەی ئەنجام ئـەدات، لەڕێگەی گەڕانەوەدا بە باوکی دەڵێت: بابە ئێسـتا من لە پارێزگاری خوادام؟! باوکیشـی دەڵێت: بەڵێ کوڕم، لەبەر ئەوەی ئەم بەیانیە بەجەماعەت نوێژەکەت ئەنجامدا..

بەیانـی، منداڵەکە دەچێت بـۆ قوتابخانە، ئەو قوتابیانەی کە ڕۆژی پێشـوو نەهاتبوون، مامۆسـتا بانگی کردنە دەرەوەو یەك یەك سـزای دان، لەبەر ئەوەی وانەکانیان ئامادە نەکردبوو، هەتا سـەرە گەیشـتە منداڵەکە.. مامۆسـتا ویستی سـزای بدات، بەڵام منداڵەکە بە مامۆسـتای وت: ناتوانی سـزام بدەی!! مامۆسـتا بەسەرسـوڕمانەوە وتی: چی؟! چۆن ناتوانم سزات بدەم؟! منداڵەکە وتی: لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (هەرکەسـێك نوێـژی بەیانی بە جەماعەت ئەنجـام بدات، خودای گـەورە پارێزگاری لێدەکات و دەیپارێـزی)، منیش ئەمڕۆ نوێژی بەیانیم بە جەماعەت ئەنجام داوە، لەبەر ئەوە من لە پارێزگاری خوادام و ناتوانی سزام بدەیت.. مامۆستاش زەردەخەنە کەوتە سەر لێوی و بە پێکەنینەوە ئافەرینی منداڵەکەی کرد لەباتی سزادان[٦٩]..

هەروەها شەوێك باوکێك لە کاتێکی درەنگدا دەگەڕێتەوە بۆماڵەوە، لە ژووری کوڕەکەیـەوە گوێـی لە دەنگی گریـان دەبێـت!! دەچێت بۆ لای کوڕەکـەی و لێی دەپرسێت بۆچی دەگریت؟! کوڕەکەی پێی دەڵێت: بۆ فلانە دراوسێمان دەگریم.. باوکی بە سەرسـوڕمانەوە دەڵێت: ئەوە گریانی بۆچیە؟! پیرەمێردێك مردووە، تەمەنێکی درێژیشـی بە سـەر بردووە.. گومانم وا بوو کارەساتێکی گەورەمان بە سـەرهاتووە!! ئەم هەموو گریانە بۆ ئەو پیرەمێـردە؟! خۆ ئەگەر من بمردمایە، بەم شـێوەیە بۆم نەدەگریایت!! کوڕەکە بە چاوی پڕ فرمێسـکەوە سەیری باوکی کردو وتی: بەڵێ.. بەم شـێوەیە بۆت نەدەگریـام، لەبەرئەوەی ئەو پیاوە بوو، کە دەسـتی گرتم و بەرەو مزگـەوت و نوێژی جەماعەتی بـردم.. فێری ئەوەی کردم کـە نوێـژی بەیانیان بە جەماعـەت ئەنجام بـدەم.. ئامۆژگاری دەکـردم هاوەڵی

---

٦٩-کاسێتی (انین الفجر).

چاکـەکاران بم‌و لە هاوڕێی خراپ دوور بکەومـەوە.. هەر ئەو بوو هانی دەدام بۆ ئەوەی قورئان لەبەر بکەم.. بەڵام تۆ هەر بە ناو باوکمیت!! کەی ئامۆژگاریەکەت کردووم؟! ئەو پیرەمێردە باوکی ڕاستەقینەم بوو، پێویستە بۆ ئەو بگریم..

لـەم کاتـەدا باوکەکـە لـە خـەوی بێئاگایـی بەخەبەردێت..قسـەکانی جگەرگۆشـەکەی کاریان تێکردو چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسـك.. کوڕەکەی لە باوەش گرت‌و پەیمانیدا لەمەودوا هەموو نوێژەکانی بە جەماعەت لە مزگەوتدا ئەنجام بدات[٧٠]..

❋ **چیرۆکی چواردەیەم**: دوو کچی بچکۆلە شەوان دەچوونە سەربان‌و یارییان دەکرد، شـەوێك وەکو شەوانی تر چوونە سەربان، بەسەرسووڕمانەوە لە دایکیان پرسی: دایکە، ئەوە بۆچی کۆڵەکەکەی سەر سەربانی ماڵی دراوسێکەمان لە شوێنی خۆیدا نەماوە؟

دایکیان وتـی: کچەکانم ئەوە (منصـوری کوڕی معتمر) بـوو کۆڵەکە نەبوو، هەر لەدوای نوێژی عیشاوە خەریکی شەو نوێژ دەبوو هەتا نزیك نوێژی بەیانی، خودا لێی ڕازی بێت وەفاتی کرد[٧١]..

خودای گـەورەش دەفەرموێت: ﴿ كَانُواْ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيۡلِ مَا يَهۡجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلۡأَسۡحَارِ هُمۡ يَسۡتَغۡفِرُونَ ﴿١٨﴾ ﴾الذاریات. واتە: (لەشـەودا زۆر کەم ئەخەوتن‌و ڕائەکشـان، چونکە سـەرگەرمی شـەو نوێژو قورئان خوێندن بـوون، لە بەرە بەیانەکانیشـدا داوای لێخۆش بوونیان لەپەروەردگاریان دەکرد)..

خوێنـەری ئازیـز: کۆمەڵـە چیـرۆك‌و بەسـەرهاتێکی تـر هـەن، تـەواو پێچەوانەی چیرۆکی بەنـدە چاکەکانی خودای پەروەردگارن، بەسـەرهاتی ئەو کەسانەی کاتێك گیانیان دەر دەچێت‌و دوورن لە بەرنامەی خودا..

لەبـەر ئـەوە باسـیان دەکەین تاوەکـو ئەگـەر کەمێکیش بێـت بەخۆمان دا بچینەوەو وەکو ئەوانمان بەسـەر نەیەت، بۆ ئەوەی خەڵکیان پێ بانگ بکەین بۆ بەهەشت‌و لە دۆزەخ ئاگاداریان بکەین..

---

٧٠-دموع المحراب.

٧١-کاسێتی (أنین الفجر).

❖ **چیرۆكی یەكەم**: بۆ هەموو ئەو كەسانەی وازیان لە مزگەوت هێناوەو لە زەلكاوی ئارەزووەكانیاندا غەرق بوون.. ئەمە لەپیاوێك ڕوویدا، تەنها ساتێكی كەمیش عیبادەتی خودای پەروەردگاری نەكردبوو، نوێژی نە دەكردو ڕۆژووی نە دەگرت، ڕێگەی هیدایەتو ڕاستی ون كرد بوو، كاتێك مردن ڕێگەی پێگرتو تاڵی گیان كێشان گەیشتە قوڕگی، پێیان وت: بڵێ: لا إله إلاّ الله.. دەزانن وتی چی؟ دەزانن بە چ زمانێك هاتە گفتوگۆ؟! خۆزگە زمانی ببەسترایەو هەر قسەی نەكردایە!! خۆ ئەگەر لەو كاتەدا بە دڵسۆزییەوە شایەتمانی بهێنایە، بێگومان بەهەشت جێگەی دەبوو..

بەڵێ.. لەكاتی سەرەمەرگدا وتی: من بێباوەڕم!! من بێباوەڕم!! بڕوانە چۆن خودای لەبیر چوو، ژیانی بە خراپەو بێباوەڕی كۆتایی هات، شەیتانو ئارەزووەكانی ڕۆژیان ڕەش كرد، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْمَى (١٢٤) قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَى وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا (١٢٥) قَالَ كَذَلِكَ أَتَتْكَ آيَاتُنَا فَنَسِيتَهَا وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنسَى (١٢٦) وَكَذَلِكَ نَجْزِي مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِن بِآيَاتِ رَبِّهِ وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَى (١٢٧) ﴾ طه.

واتە: (ئەوەی ڕوو وەربگێڕێت لە بەرنامەو یادی منو پشتی تێبكات، بێگومان بۆ ئەو كەسانە ژیانێكی ترشو تاڵو ناخۆش پێشدێتو لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە كوێری حەشر دەكرێن ● ئەو جۆرە كەسە دەڵێت: ئەی پەروەردگار بۆ بەكوێری حەشرت كردم، خۆ من كاتی خۆی چاوم ساغ بوو ● خودای گەورەش پێی دەفەرموێت: تۆ كوێر بوویت لە ئاستی ئایەتەكانی ئێمە داو پشت گوێت دەخستن، ئێمەش ئەمڕۆ ئاوا پشت گوێت دەخەینو لەبیرت دەكەین ● ئا بەو شێوەیە تۆڵە لەو كەسانە دەكەینەوە كە سنوور دەبەزێننو باوەڕ بە ئایەتەكانی خودا ناهێننو بێگومان سزای ڕۆژی دوایی زۆر سەختترو بەردەوام ترە)[٧٢]..

❖ **چیرۆكی دووەم**: لە یەكێك لە ڕێگە خێراكانی نێوان شاری (مەككە) و (جدة) دا ئەم ڕووداوە ڕوویدا، كاتێك ئۆتۆمبیلێك وەرگەڕاو ڕێبوارانی ڕێگە ویستیان ڕزگاری بكەن، بینیان شۆفێرەكە وا لە سەرە مەرگ دایەو دەنگی

---

٧٢-یالیت قومي یعلمون.

گۆرانی تەسـجیلەکەی بە بەرزی ئیش ئەکات، پاش ئەوەی کوژاندیانەوە، یەکێك لە ڕێبوارەکان پێی وت: بڵێ: لا إله إلاّ الله.. ئا لەم کاتە ناسکەدا، دەستیکرد بە جنێو دان بە ئیسلام و هاواری دەکرد: من نامەوێت نوێژ بکەم.. نامەوێت ڕۆژوو بگرم.. بەڵێ.. بەو حاڵەوە گیانی دەرچوو، خودا بمان پارێزێت[٧٣]!

❖ **چیرۆکی سێیەم**: چیرۆکیکی سەیرو ناوازەیە، مرۆڤ لە بەرامبەریدا لە گریان و حەسـرەت زیاتر، هیچی تری بۆ ناکرێ، ئێمەش داوا لە خودای گەورە دەکەیـن و دەڵێیـن: (اللّهُمّ یـا مُقلّبَ القُلـوب ثبّـت قُلوبَنا عَلى دینـك).. خودای گـەورەش دەفەرموێـت: ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴿٨﴾ ﴾ال عمـران. واتـە: (خوایە گیان، دڵەکانمـان لامەدە لە ڕێگەی ڕاست، دوای ئەوەی کە هیدایەتت داین و لە بەخششی خۆت بەهرە مەندمان بکە، بەڕاستی تۆ بەخشندەی)..

لە میسـر، پیاوێك هەبوو، پابەند بوو بـە مزگەوت و بانگ و نوێژەوە، ئیمان و باوەڕی پێوە دیار بوو.. ڕۆژێك سەر کەوتەسەر منارەی مزگەوت، بۆ ئەوەی بانگ بدات، لە ژێر منارەکەدا ماڵێکی مەسیحی هەبوو، پیاوەکە سەیری ماڵەکەی کردو چـاوی بە کچـی خاوەن ماڵەکە کـەوت، دڵی گیرۆدە بوو بە کچەکـەوەو دابەزی و ڕۆی بۆ ماڵیان، کچەکە لێی پرسی: ئەوە چیە؟! چیت دەوێت؟! پیاوەکە وتی: تۆم دەوێت.. دڵت لێسەندووم و بیرو هۆشم لەلاتە!!

کچەکـە وتی: گومانـم هەیـە.. پیاوەکە وتی: ئەتخـوازم.. کچەکـە وتی: من مەسـیحیم و تـۆش موسـوڵمان، باوکـم نامـدات بەتـۆ.. پیاوەکە وتـی: دەبم بە مەسـیحی.. کچەکە وتی: ئەگەر وابکـەی من ئامادەم.. پیاوەکە هاتە سـەر دینی کچەکەو لە دینەکەی خۆی هەڵگەڕایەوە، بۆ ئەوەی کچەکە شووی پێبکات..

هەر لەو ڕۆژەدا، پیاوەکە ویسـتی سـەرکەوێتە سـەر خانـووی ماڵی کچەکەو کەوتـە خوارەوەو کتوپڕ گیانی دەرچوو!! دینەکەی لەدەسـت داو کچەکەشـی بۆ نەبوو!! بەڕاسـتی ژیانی بەشێوەیەکی خراپ کۆتایی پێ هات و چارە ڕەش بوو بۆ هەتا هەتایی..

---

٧٣-أهل النار / يوسف الحاج احمد.

یارب فارزقنا الثبات علی الهدی وعلی السلوك طریقة البیضاء
واسلك بنا نهج النجاة ونجّنا من شر كل ضلالة عمیاء
واجعل كتابك یاكریم امامنا ورسولك المقدام للحنفاء[74].

❖ **چیرۆکی چوارەم:** پیاوێك خوشکێکی دەمرێت، لەکاتی ناشتنیدا جزدانی پارەکەی دەکەوێتە گۆڕی خوشکەکەیەوەو بیری دەچێت هەڵیبگرێتەوە، کاتێك لەناشتنی دەبنەوەو دەگاتە ماڵەوە، ئەوسا بیری دەکەوێتەوەو دەگەڕێتەوە بۆلای گۆڕی خوشکەکەی، بۆ ئەوەی جزدانی پارەکەی دەربهێنێتەوە.. دەستی کرد بە هەڵدانەوەی گۆڕەکە، بەڵام چی ببینێت؟! لاشەی خوشکەکەی بینی ئاگر دەورەی داوەو سوور بۆتەوە، زۆر بە پەلەو بە ترسەوە لاشەکەی داپۆشی و گەڕایەوە بۆ ماڵەوەو پرسیاری لە دایکی کردو وتی: دایە ئەو خوشکەی من چ کردارێکی خراپی هەبوو؟! دایکی ووتی: کوڕم، سوێند بە خودا هیچ کردارێکی خراپی نەبوو، تەنها نوێژەکانی دوا دەخست.. نوێژی دەکرد، بەڵام دوای دەخست.. نوێژی نیوەڕۆی ئەنجام نە ئەدا، تا نزیکی عەسر.. نوێژی عەسری ئەنجام نە ئەدا تا نزیکی ئێوارە، هەروەها نوێژەکانی تریش.. خودای گەورەش دەفەرمووێت:﴿ فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ﴿٤﴾ الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ﴿٥﴾ ﴾ الماعون .واتە: (هاوارو واوەیلا بۆ نوێژکەرانێك * ئەو نوێژکەرانەی کە گوێ نادەن بە نوێژەکانیان و دڵی نادەنێ و لێی بێ ئاگان).. ئەی ئەبێت حاڵی ئەو کەسانە چۆن بێت کە هەر نوێژ ناکەن[75]؟!!

❖ **چیرۆکی پێنجەم:** یەکێك لەو ئافرەتانەی کە مردوو ئەشۆن لەبەر خودا، دەگێڕێتەوەو دەڵێت: ڕۆژێك پەیوەندییان پێوەکردم، کە بچم ئافرەتێکی مردوو بشۆم، منیش چووم، کاتێك چوومە ئەو ژوورەی کە ئافرەتە مردووەکەی لێ بوو، یەکسەر دەرگاکەیان لێ داخستم و بەتەنها مامەوە لەگەڵ مردووەکەدا، لە دەرگامدا کەس لێی نەکردمەوە، ترسێکی زۆر دای گرتم و دەستم کرد بە خوێندنی ئایەت و یادی خودای پەروەردگار، پاشان بە پشت بەستن بە خودا

---

٧٤-یالیت قومي یعلمون.

٧٥-کاسێتی (انین الفجر).

دەستم کرد بەشۆرینی مردووەکە..

کاتێك دەم و چاویم هەڵدایەوە، زۆر ڕەش هەڵگەڕابوو.. وەکو پارچەیەك خەڵوز وابوو، دووبارە ترس دایگرتمەوە، بەڵام بەهیوای پاداشتی خودا دەستم کردەوە بە شۆرینی.. گۆشتی لاشەی هەر وەك لۆکە هەڵئەوەری.. زۆر بە پەلە لە شۆرینی بوومەوەو تەواو بووم، بەڵام چۆن تەواو بوونێك!! لە دەرگام دایەوەو ئاگادارم کردن کە تەواو بووم، زۆر بڕوایان نە دەکرد، چونکە زۆر بە پەلە شۆریم و کفنم کرد.. کاتێك دەرگایان لێ کردمەوە، زۆر بە خێرایی گەڕامەوە بەرەو ماڵەوە، تا ماوەی سێ ڕۆژ خەوم لێ نەکەوت و هەر دەگریام.. پاشان پەیوەندیم بە مامۆستایەکی ئاینیەوە کرد و حاڵەتەکەم بۆ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ڕەشیەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی نوێژنەکەر بووەو هەڵوەرینی گۆشتەکەشی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە باڵاپۆش نەبووەو لەش و لاری بۆ خەڵکی دەرخستووە..

پاش تەواوبوونی پرسەکەیان چوومەوە بۆ ماڵی ئافرەتە مردووەکەو لێم پرسین: بۆچی دەرگاکەتان لەسەر داخستم؟! وتیان: لە پێش تۆدا سێ ئافرەتی ترمان بانگ کرد، کاتێك لاشەی مردووەکەمانیان بینی ڕازی نەبوون بیشۆن، بۆیە چارمان نەماو دەرگامان لەسەر داخستی بۆئەوەی ناچاربیت بیشۆیت..

پاشان پرسیارم کرد دەربارەی ئافرەتەکەو وتیان: نوێژی نە دەکرد و باڵا پۆشیش نەبوو[٧٦]...

بەڵێ.. خوشك و برای بەڕێزم.. بانگت دەکەم بۆ پێنج نوێژەکەت، زۆر کەس بەیانی ناگاتە ئێوارە، ئێوارە ناگاتە بەیانی.. چەندان موسڵمان لە وڵاتانی بێگانەدان و مەحرومن لە بیستنی بانگ.. چەندین کەس هەن نەخۆش و بێتوانان و ناتوانن نوێژەکانیان بە جەماعەت ئەنجام بدەن..پێشوازی لە ڕۆژێکی نوێ بکە، بە تەوبەو پەشیمانی.. تەوبەو پەشیمانی لاپەڕەی گوناهەکانت دەسڕنەوە..

أقبل على صلواتك الخمس | كم مصبح وعساه لايمسي
واستقبل اليوم الجديد بتوبة | تمحو ذنوب صحيفة الأمس

---

٧٦-أهل النار.

بزانە نوێژ ڕووناکیە بۆ ڕوخسـار و هۆکارێکیشـە بۆ ئاسوودەیی دڵو دەروون .. پیـاو چاکانی پێشـوو، ئەگـەر جارێ لە جاران لـە (الله أكبر) ی نوێژ دابەسـتن دوا بکەوتنایـە، ئەوا سـەرە خۆشـییان لە یەکتر دەکـردو دەیان وت: ئەوکەسـە لێقەوماوو داماو نیە کە کەسـێکی خۆشەویستی لەدەسـت داوە، بەڵکو لێقەوماو ئەو کەسەیە کە پاداشتی لەدەست چووە..

لیس المصاب مَن فقد الأحباب ولكن المصاب مَن حرم الثـواب

❋ کاتێك سـەعیدی کوڕی مسـەییەب لە سـەرەمەرگدا دەبێت، کچەکەی بۆ نزیـك بوونـەوەی مەرگی باوکی دەسـت دەکات بە گریان.. لەم کاتەدا سـەعیدی کوڕی مسەییەب بە کچەکەی دەڵێت: مەگری کچم، شەست ساڵە نوێژی جەماعەتم لە دەسـت نەچووەو چل سـاڵیان پێش ئەوەی بانگدەر بانگ بـدات لە مزگەوتدا ئامادەبووم و لەم ماوەیەشدا (الله أكبر)ی نوێژ دابەستنم لە دەست نەچووەو قاچی کەسیشـم لە نوێژدا نەبینیـوە، لەبەرئەوەی هەر لە ڕیزی پێشـەوەدا نوێژەکانم ئەنجامداوە[٧٧]..

بـەڵام بە داخەوە ئێسـتا تا بانگ نەدات، خەڵکی بیـری نوێژیان ناکەوێتەوە، کەسـی واش هەیە بە درێژایـی تەمەنی نایەت بۆ مزگەوت تەنهـا نوێژێك بکات، بەڵکو کاتێك دەیهێنن بۆ مزگەوت، بۆئەوەی نوێژی لە سـەر بکرێت، کە دروسـت نیە نوێژ لە سەر کەسێك بکرێت کە نوێژی نەکرد بێت..

❋ سـلێمانی کـوڕی میهـران حەفتـا سـاڵ لـە (الله أكبـر)ی نوێـژ دابەسـتن دوانەکەوتـووە.. بە پێچەوانـەوە خەڵکانی وا هەن لەوانەیە لە سـاڵێکدا جارێك یان دووجار فریای (الله أكبر) ی یەکەم نەکەون..

کاتێك کە پێش نوێژ سـڵاو دەداتـەوە، دەبینیت زۆربەی نوێژخوێنان فریای هەمـوو نوێژەکـە نەکەوتـوون و هەڵدەسـتنەوە بۆ ئـەوەی نوێژەکەیـان تەواو بکەن..

❋ ئوسەیدی کوڕی جەعفەر دەفەرموێت: هەرگیز مامەمم نەبینیوە لە (الله أكبر) ی نوێژ دابەسـتن دوا بکەوێت و هەرگیزیش نەمبینیوە کەسـێکی هەژار لە

---

٧٧-المسك والعنبر في خطب المنبر و حدائق ذات البهجة/ د. عائض القرني.

مزگەوتدا داوای یارمەتیو خێر بکاتو بەشی نەدات..

❋ ئیبن سەماعە دەفەرموێت: ماوەی چل ساڵ لە (الله أکبر)ی یەکەم دوانەکەوتم، تەنها ئەو رۆژە نەبێت کە دایکم کۆچی دوایی کرد..

❋ ئیبراهیمی نەخەعی دەفەرموێت: ئەگەر پیاوێکت بینی لە (الله أکبر) ی نوێژ دابەستندا ساردو سڕی دەکرد، ئەوا دەستی لێبشۆ..

❋ سلێمانی کوڕی حەمزەی مەقدیسی (قازی شام) دەفەرموێت: لە ژیانمدا تەنها دوو جار نوێژی جەماعەتم لە دەست چووەو واشدەزانم ئەو دوو جارە نوێژم هەر نەکرد بێت، لە کاتێکدا تەمەنی ئەم پیاوە نزیکەی نەوەد ساڵ بووە[78]..

❋ حاتەمی ئەصەم دەفەرموێت: نوێژێکی جەماعەتم لە دەست چوو، تەنها ئەبو ئیسحاقی بوخاری سەرەخۆشی لێکردم، خۆ ئەگەر کوڕێکم بمردایە، دەیان هەزار کەس سەرەخۆشییان لێدەکردم[79]..

❋ ئەبو هورەیرە ﷺ لەگەڵ خێزانەکەیو کچەکەیدا شەویان لە نێوان خۆیاندا دابەش کرد بوو، هەریەکەیان سێ یەکی شەو نوێژیان ئەنجام دەدا، بەم شێوەیە شەو تا بەیانی لە ماڵی ئەبو هورەیرەدا نوێژ ئەنجام دەدراو ماڵەکەیان بە خودا پەرستی ئاوەدان کردبۆوە[80]..

❋ محمەدی کوڕی خەفیف نەخۆشیەکی توندی هەبوو، ئەوەندە ئازاری هەبوو لە جوڵەی خست بوو، بەڵام کاتێك گوێی لە بانگ دەبوو، پیاوێك دەیکردە کۆڵیو دەیبرد بۆ مزگەوت، پێیان دەوت: خودا مۆڵەتی داوی بۆچی ئەوەندە عەزیەتی خۆت دەدەیت؟! ئەویش لە وەڵامدا دەیفەرموو: هەر کاتێك بانگیداو منتان لە ڕیزی نوێژدا نەبینی، ئەوا بزانن من مردوومو لە گۆڕستان ئەسپاردەیان کردووم[81]..

براو خوشکی ئیماندار: زۆربەمان ئیشو کارو سەرقاڵی ڕۆژانە خەریکی

---

٧٨-أين نحن من هؤلاء/ د. عبدالملك القاسم.

٧٩-وما خلقت الجن والإنس إلا ليعبدون.

٨٠-دموع الصالحين/ أبو الفداء محمد عزت محمد عارف.

٨١-وما خلقت الجن والإنس إلا ليعبدون.

کردوویـن و دووری خسـتووینەتەوە لـە نوێـژی جەماعەت و مزگـەوت و نوێژە سـوننەتەکان، یەکێکی وەك هارونە ڕەشـید کاتێك بوو بە خەلیفەی موسڵمانان، هەموو ڕۆژێك سەد ڕکات تەنها نوێژی سوننەتی دەکرد..

❃ پیـاو چاکێك بەنـاوی ((عامری کـوڕی عبـدالله)) کاتێك گوێـی لە بانگ دەبێت، بە کوڕەکانی دەڵێت: هەڵم گرن و بمبەن بۆ مزگەوت.. کوڕەکانیشـی پێی دەڵێـن: ئاخر تۆ نەخۆش و پەککەوتەی نـاو جێگەی!! ئەویش دەڵێت: ئەی چۆن گوێم لە (حيّ على الصلاة) بێت و نەچم بە دەمیەوە؟!

کوڕەکانـی دەیبەن بۆ مزگەوت،بـەڵام لە کاتی نوێژدا گیانی سـپارد و وەفاتی کرد[٨٢]..

❃ موحەممەدی کوڕی مونکەدیر دەفەرموێت: خۆشیەکانی دونیا لای من سێ شتن: (شەو نوێژ ـ هەڵسوکەوت لەگەڵ موسڵمانی باشدا ـ نوێژی جەماعەت)..

ئایـا بەرامبـەر بـەو کەسـانە دەڵێی چی، کـە وازیان لـە نوێـژی جەماعەت هێنـاوە؟! ئایـا ئەو کەسـانە ئـەم ئایەتـەی خـودای گەورەیـان نەبیسـتووە کە دەفەرموێـت: ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرۡكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾ البقـرة. واتە: (نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکات بدەن و لەگەڵ کڕنوش بەراندا کڕنوش بەرن)..

کەواتـە خودای گەورە فەرمانی پێکردوین لەگـەڵ نوێژ خوێناندا و بەکۆمەڵ نوێژ بکەین نەك بەتەنها.

ئەی ئەو کەسەی لەماڵەوە بە تەنها نوێژەکەت دەکەیت، ئایا ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرت ﷺ نەبیسـتووە؟ کاتێك پیاوێکی کوێر دێتەلای و پرسـیار دەکات و دەڵێت: من کەسم نیە دەستم بگرێت و بمهێنێت بۆ مزگەوت.. پێغەمبەری خودا ﷺ پێـی دەفەرموێت: مادام گوێـت لەبانگ دەبێت، دەبێـت بێیت بۆ مزگەوت و بەجەماعەت نوێژەکەت ئەنجام بدەیت..

❃ عبـدالله ی کـوڕی مەسـعود ﷺ دەفەرموێت: هەرکەسـێك حـەز دەکات لـە ڕۆژی قیامـەت دا بە موسـڵمانی بگاتـە خزمەتی خـودای گەورە، بـا ئاگای لە

---

٨٢- ياليت قومي يعلمون.

نوێژەکانــی بێت و بە جەماعــەت ئەنجامیان بدات، لە بەرئــەوەی خودای گەورە چەنـد ڕێگەیەکـی هیدایەتی داناوە بـۆ پێغەمبەر ﷺ و نوێــژی جەماعەتیش یەکێکە لە ڕێگەکانی هیدایەت.. کەواتە ئەوە بزانن ئەگەر نوێژەکانتان لە ماڵەوە ئەنجـام بدەن، ئەوا وازتان لە ســوننەتێکی پێغەمبەر ﷺ هێنــاوە،وە ئەگەر واز لە ســوننەتەکانی بهێنن، ئەوا ڕێگەی ڕاســتتان لێ وون دەبێت و ســەر لێشــێواو و سەرگەردان دەبن..

بزانــن هەر کەســێك کاتێك دەســت نوێــژ ئەگرێــت و بەرەو مزگــەوت بەڕێ دەکەوێــت، بەهــەر هەنگاوێــك چاکەیەکــی بۆ دەنوســرێت و بە هەنگــاوی دوای ئەو خراپەیــەك لە خراپەکانی دەســڕێتەوە.. بێگومانیش ئەو کەســانەی کە لە مزگــەوت دائەبڕێــن و دوور دەکەونەوە، لــەم حاڵەتانە بەدەر نیــن، یان دووڕوو (منـافق)ن، یان لە بەر نەخۆشــی ناتوانن بێن بۆ مزگەوت،یاخود بیانویەکی تری شەرعیان هەیە..

پیــاو چاکانی پێشــوو ئەگــەر نەیان توانیایــە بچن بۆ مزگــەوت، ئەوا کەس و کاریان هەڵیان دەگرتن و دەیان بردن بۆ مزگەوت..

❁ ڕەبیعــی کــوڕی خیثــم یەکێکــە لــە تابیعیــن و هەڵوێســتێکی جوانی لە ژیانیــدا تۆمار کــردووە، کاتێك نەخۆش بوو، لایەکی لاشــەی مردبــوو، کە بانگ ئــەدرا، دەچووە نێوان دوو کەس لــە خزمەکانی، بۆ ئەوەی بیگەیەننە مزگەوت و نوێژەکانی بە جەماعەت ئەنجام بدات، پێیان دەوت: تۆ نەخۆشی و خودای گەورە مۆڵەتی داوی کە بەشــداری نوێژی جەماعەت نەکەیت!! ئەویش دەیووت: کاتێك گوێمــان لە دەنگی (حــي علی الصلاة ـ حــي علی الفلاح) دەبێت، پێویســتە وەکو منداڵ بەگاگۆڵکێ، یان لەسەر دەست و سك بچین بۆ مزگەوت[٨٣]..

| | |
|---|---|
| يمشون نحو بيوت الله إذ سمعــوا | ألـلّـه أكبـر في شوق وفي جذل |
| أرواحــهـم خشعت لـلــه في أدب | قلوبهم من جلال الله في وجل |
| هـم الرجال فلا يلهيـهم لـــعب | عن الصلاة ولا أكذوبة الكسل |

---

٨٣-ياليت قومي يعلمون.

ئایـا ئەزانن هەندێـك لە پیاوان نوێژی بەیانی بــە جەماعەت ئەنجام نادەن؟ بەڵکو پەنا بە خودا هەندێك کەس نوێژی بەیانی هەر ناکەن!!

پێغەمبــەر ﷺ دەفەرموێت: (مَن صلـىّ الصُبحَ فهُوَ في ذمَةِ اللهِ، فَلا يُطلبَنّكُمُ اللهُ من ذمّته بِشَيءٍ، فإنَهُ مَن يَطلُبُهُ من ذمّته بشَيءٍ يُدرِكُهُ، ثُمّ يَكُبُهُ عَلى وَجهه في نارِ جَهَنَم)[٨٤]. واتە: (هەرکەســێك نوێژی بەیانی ئەنجام بدات، لەپاراستنی خوادا دەبێتو خـودای گەورەش داوای هیچ شـتێکی لێ ناکات،وە هەرکەسـێك خودای گەورە داوای شـتێکی لێ بکات، لە دەستی خودا ڕزگاری نابێتو پاشان لەسەر سەر دەیخاتە ئاگری دۆزەخەوە)..

هەروەهـا دەفەرموێـت: (لَيسَ صَـلاة أثقَل عَلـى المُنافقينَ مِن صَـلاةِ الفَجرِ وَالعشاء، وَلَو يَعلَمونَ ما فيهِما لأتَوهُما وَلَو حَبوًا)[٨٥]. واتە: (بە دڵنیاییەوە گرانتـرین و قورسـترین نوێژ لە سـەر دووڕووەکان بریتیە لە نوێژی بەیانیو عیشـا، ئەگەر بیان زانیایە چەند خێری تێدایە، ئەوا بە سکە خشکێش بوایە هەر دەهاتن)..

بەڵام تۆ، ئەی ئەو کەســەی وازت لە خۆشی خەوو نەرمی جێگەکەت هێناوەو لەتاریکــی شەوداهەڵســاوی بــۆ نوێژو بــەرەو مزگــەوت هەنگاو دەنێــی، مژدەت ئەدەمێ بەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێت: (بَشِـرِ المَشّـائينَ في الظُلَمِ إلى المَساجِدِ بِالنُورِ التّامّ يَومَ القِيامَة)[٨٦]. واتە: (موژدە بدە بەو کەسانەی کە لەتاریکی شــەودا بەرەو مزگەوت دەڕۆن بە ڕۆشناییەکی تەواو لەڕۆژی دوایدا)..

لەکاتێکداخەڵکــی لەو ڕۆژەدا لــە تاریکیدان، دوو نوێژ لە تاریکی شــەودا ئەنجام دەدرێن، ئەوانیش نوێژی عیشاو نوێژی بەیانیە ..

دەی هــەوڵ بدە شــەو زوو بخەویــت، هەروەها ویــردو زیکــرەکان بخوێنە لە پێش خەوتندا، نیەتی ئەوەشــت هەبێت کە بە نیازی هەڵسیت بۆ نوێژی بەیانی، هەوڵیش بدە بە دەســتنوێژەوە بخەویت، (إن شــاء الله) خەبــەرت دەبێتەوەو لەو خێرو پاداشتە گەورەیە بێبەش نابیت..

---

٨٤-رواه مسلم.

٨٥-رواه البخاري ٦٥٧ ومسلم ٤٥١.

٨٦-رواه إبن ماجة.

ألا يا نفس ويحك ساعديني بسعي منك في ظلَم الليالــي
لعلك في القيامة أن تــفوزي بطيب العيش في تلك العلالي

هـاوار بۆ تۆ ئـەی نەفس، یارمەتیـم بدە لە تاریکی شـەودا، بەڵکـو لە ڕۆژی دوایدا سـەرفرازو سـەرکەوتووبیت، تاوەکو خودای گەورە خۆشـترین ژیانت پێ ببەخشێت لە بەهەشتی نەبڕاوەدا..

## ئەوکەسانەی تەنها لە ڕەمەزاندا خودا پەرستی دەکەن

براو خوشکی بەڕێز: هەندێ لە خەڵکی تەنها لە ڕەمەزاندا عیبادەتی خودای پەروەردگاریان دەکەن.. بەڕاسـتی خراپترین کۆمەڵن ئەو کەسانەی کە تەنها لە مانگی ڕەمەزاندا خودا پەرسـتی دەکەن و پاشـان وازی لێدەهێنن.. ئەو کەسـانە مزگەوتـەکان پڕدەکەن، بەتایبەت لە نوێژی بەیانی و ئێوارەی مانگی ڕەمەزاندا، بـەلام کاتێـک ڕەمەزان تـەواو دەبێـت، زۆر بە زوویـی ون دەبن و دیـار نامێنن!! ئەی نازانن خودای ڕەمەزان هەمان خودای مانگی شـەعبان و شـەوال و سەرجەم مانگەکانـی ترە؟! هەندێک کەسـی تر هـەن تەنها ڕۆژانی هەینـی نوێژ دەکەن و دەڵێن: فەرموودە هەیە کـە دەفەرموێت: ئەم هەینی بۆ ئەو هەینی دەبێتە هۆی لابردنی گوناهو تاوان.. ئێمەش پێیان دەڵێین: ڕاسـت دەکەن، بەلام فەرموودەکە بەتـەواوی بخوێننەوە، کە دەفەرموێت: (الصَلَواتُ الخَمـس، وَالجُمُعَةُ إلى الجُمُعَة، وَرَمَضانُ إلى رَمَضان، مُكَفِراتُ ما بَينهُنَ إذا اجتُنِبَتِ الكَبائِر)[87]. واتە: (پێنج نوێژە فەرزەکـەو نوێژی هەینی بـۆ هەینیەکی تر و ڕەمەزان بۆ ڕەمـەزان، دەبنە هۆی سڕینەوەی تاوانەکان، بەمەرجێک تاوانی گەورەی ئەنجام نەدابێت)..

---

٨٧- رواه مسلم٢٣٣.

# ئەنجام نەدانی نوێژ

نەکردنـی نوێژ نەك هەر تاوانی گەورەیە، بەڵکـو لە هەرە تاوانە گەورەکانە، هەندێـك لە زانایان نوێـژ نەکردن بە کوفرو بێباوەڕی دادەنێـن، پەنا بە خودا.. پێغەمبـەری خودا ﷺ دەفەرموێـت: (إنَ بَينَ الرّجُلِ وَبَينَ الشـرك وَالكُفر، تَركُ الصَلاة)[88]. واتـە: (بێگومان نێوانی پیاوو هاوەڵ دانان بۆ خـوداو بێباوەڕی، وازهێنانە لە نوێژ).. لەبەر ئەوەی ئەنجام دانی نوێژ نیشانەیەکی دیارو بەرچاوەو بەڵگەیە لەسەر موسڵمانێتی‌و وازهێنانیشی بەڵگەیە لەسەر بێباوەڕی..

براو خوشـکی ئیماندار: دوورنیە لـە کاتی کار کردنتدا یـان لە قوتابخانەو زانکۆ دا کەسـانێکت لەگەڵ بن کە ساردو سـڕن لە نوێژەکانیاندا، بەڵکو لەوانەیە کەسـانێکت لەگەڵ بن، هـەر نوێژیش نەکەن.. دڵنیابە هەندێك لەو کەسـانە بە ئامۆژگـاری‌و ووتەی جـوان بەرەو نوێژ هەنگـاو دەنێن، ئەگـەر هەوڵیان لەگەڵ بدرێت، چونکە ئەو کەسـانەش حەز بە چوونە بەهەشـت دەکەن، بەڵام ڕێگەیان ون کردووە..

براو خوشکی دڵسۆزم: جارێك لە جاران بیرت کردۆتەوە کە بانگی چەند کەسێك بکەیت‌و ئامۆژگارییان بکەیت، بۆ ئەوەی لەسەر نوێژەکانیان بەردەوام بن؟!

ئایا هیچ کاتێك بیرت لەوە کردۆتەوە لەو ماڵ‌و سەروەت‌و سامانەی کە خودای گەورە پێی بەخشـیویت، مانگانـە چەند نامیلکەو کتێبێك بکڕیت‌و پێشکەشـی ئەو کەسـانەی بکەیت؟ ئایا جارێك لە جاران کاسـێتێکی بەسودت پێشکەش بەو کەسـانە کردووە؟ یان هیچ کاتێك باسی ناڕەحەتی دۆزەخ‌و خۆشی بەهەشتت بۆ کردوون؟ یان ئەوەندە هەوڵت داوە لەگەڵ ئەو کەسـانەدا، تاوەکو لە ڕۆژی دوایدا لەلای خودای پەروەردگار بەر پرسیار نەبیت؟!

ئەگـەر وەڵامەکەت بریتیە لـە (نەخێر) دەی کەواتە لەمـەودوا هەوڵەکانت بخـەرە کار، چونکـە ئەگـەر تەنها یـەك کەس خودای گەورە لەسـەر دەسـتی تۆ هیدایەتی پێببەخشێت، ئەوا باشترە بۆ تۆ لە هەموو دونیا. .

---

٨٨-رواه مسلم.

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (مَن دَعَا إلى هُدَى، كانَ لَهُ مِنَ الأجرِ مِثلَ أُجُورَ مَن تَبِعَهُ إلى يَومِ القِيامةِ، مِن غَيرِ أن يُنقَصَ مِن أُجُورِهِم شَيئاً)[٨٩].
واتە: (ئەگەر کەسێك بانگ بکەیت بۆ سەر ڕێگەی ڕاست و هیدایەت، ئەوا هەمان خێری ئەوانەت هەیە کە خودا هیدایەتیان دەدات، هەتا ڕۆژی قیامەت، بەبێ ئەوەی هیچ لە خێرو چاکەی ئەوان کەم بکات)..

ئەی ئەو کەسانەی پێنج فەرزەی نوێژ ئەنجام دەدەن.. ئەی ئەوانەی خۆشی و چێژی نوێژتان هەست پێکردووە، کەمێك بە جێتان دەهێڵم، بۆ ئەوەی بانگەوازێك ئاڕاستەی دڵی ئەو کەسانە بکەم، کە دوورن لە نوێژو خۆشیەکانی.. بانگیان دەکەم بۆ باخێك لە باخەکانی بەهەشت، بۆ باخێکی پڕ لە گوڵ و گوڵزارو ڕووناکی، بۆ ئەو شوێنەی بەیانی و ئێوارەو ڕۆژی پێنج جار بانگ خوێن بانگ ئەدات و دەڵێت: ألله أكبر...ألله أكبر...

بانگیان دەکەم بۆ مزگەوت، بۆ ئەو شوێنەی کە پێویستە شەرم بیانگرێت، کاتێك خودای گەورە بانگیان دەکات و ناچن بە دەم بانگەکەیەوە، بانگیان دەکەم بە ئایەتەکانی خودای پەروەردگار و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵەکانی، بۆ ئەوەی دەرمانی نەخۆشیەکانیان بۆ دیاری بکەین، چونکە بە دڵنیاییەوە ئەو کەسانە ئومێدو خێری زۆریان تێدایە..

❖ دەی ئەوانیش باگوێمان لێبگرن، دەی کەواتە گوێمان بۆ شلکەو دەرگای دڵت ئاوەڵا بکە، بۆ ئەوەی بە دڵسۆزییەوە کەم و کوڕییەکانت دیاری بکەین، لێمان ببورە باسی کەم و کوڕییەکانت دەکەین، دەی تۆش بە خۆتدا بچۆرەوەو سەرزەنشتی خۆت بکە، چونکە ئێمە مەبەستمان خۆشی و شادی و سەرفرازی تۆیە لە ژیانی دونیاو دواڕۆژیشدا.. بانگت دەکەین و پێت دەڵێین: لە نوێژەکانت بێ ئاگایت؟! کاتەکانت بە فیڕۆ دەدەیت و بەردەوام لە مردن نزیك دەبیتەوەو توێشوی سەفەریشت زۆر کەمە!

❖ ئەی ئەو کەسەی نەفس و ئارەزووەکانت مردنیان لە بیرت بردۆتەوە..

❖ ئەی ئەو کەسەی بەشت هەر خەوو پاڵدانەوەی سەر جێگەو سەرینە..

---

٨٩- رواه مسلم.

❖ ئـەی ئەو کەسـەی بـە نرخترین تەمەنـت کە تەمەنـی لاوێتیتـە، لە بێ فەرمانی خوادا بەسەردەبەیت..

❖ ئایـا ئەزانـی چاوێکـت نیـە فرمێسـك برێـژێ بـۆ کەمتـەر خەمیـت لە نوێژەکانت؟! بۆ دووریت لە براو خوشکە نوێژ خوێنەکانت؟!

❖ ئایـا کاتی ئەوە نەهاتـووە، کە دڵە ڕەقـەکان نەرم ببـن و بگەڕێنەوە؟! ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿١٦﴾﴾ الحديد. واتە: (ئایـا کاتی ئـەوە نەهاتووە، بۆ ئەوانـەی باوەڕیان هێنـاوەو دڵەکانیان بە نووری ئیمـان ملکەچ و ڕووناك بۆتەوە، کە ترسـی خـودای تێدا بڕوێنن، بـە هۆی یادی بەردەوامـی خوداو ئەو قورئانـەی کە ڕەوانە کراوە، وەك ئەو کەسـانە نەبن، کە کتێبی ئاسـمانیان بۆ ڕەوانە کرا، بەڵام دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی دوورو درێژ، دڵیان ڕەق و ڕەش بوو، زۆربەشیان سەرکەش و یاخی دەرچوون)..

❖ ئایا نەتبیستووە خودای گەورە چی دەفەرموێت:﴿أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾﴾القلم. واتـە (ئایا ڕەوایـە، پاداشـتی موسـڵمانان وەك پاداشـتی تاوانباران بێت؟!)

سـوێند بە خودا سـەفەری مردن نزیك بۆتەوە.. سەفەری جێهێشتنی دونیاو کۆچ کردن بۆ ڕۆژێك کە بریتیەلە:

نهاية الحياة و بداية الآخرة

نهاية العمل وبداية الجـزاء

کۆتایی ژیـان و سەرەتای ئاخیرەت

کۆتایی کردەوەو سەرەتای سزاو پاداشت

ئایـا چیت ئامـادە کردووە، بۆ ئـەو ڕۆژەی کە لـە بەردەمی خـودای گەورەدا دەوەسـتێنرێیت؟ بەهەشـتت خۆش دەوێت، وانیە؟! ئایا چیت پێش خستووە بۆ ئەوەی بچیتە بەهەشـت؟

براو خوشـکی بەڕێزم: بزانە گرنگترین سـیفەت لە سـیفەتەکانی خەڵکی بەهەشـت، پارێزگـاری کردنیانـە لـە نوێژەکانیـان، هـەروەك خـودای گـەورە

دەفەرمویت:﴿ وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾ أُولَٰئِكَ هُمُ الْوَارِثُونَ ﴿١٠﴾ الَّذِينَ يَرِثُونَ الْفِرْدَوْسَ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ ﴿١١﴾ ﴾ المؤمنون. واتە: (ئەوانەی پابەندی نوێژەکانیانن و پارێزگارییان لێدەکەن * ئەوانە خاوەن و میراتگری بەهەشتن * ئەوانە دەبنە خاوەنی بەهەشتی فیردەوس و بۆ هەمیشە ژیانی تێدا دەبەنە سەر)..هەروەها دەفەرمویت:﴿ وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴿٣٤﴾ أُولَٰئِكَ فِي جَنَّاتٍ مُكْرَمُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ المعارج. واتە: (ئەوانەی کە پارێزگاری لە نوێژەکانیان دەکەن* ئەوانە لە باخەکانی بەهەشتدا ڕێز لێنراون)..

❖ ئەی ئەوکەسەی کە گرنگی بە نوێژەکانت نادەیت، ئایا ئەم هەڕەشەیەی خودای گەورەت نەبیستووە؟ کە دەفەرمویت:﴿ فَخَلَفَ مِنْ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ أَضَاعُوا الصَّلَاةَ وَاتَّبَعُوا الشَّهَوَاتِ ۖ فَسَوْفَ يَلْقَوْنَ غَيًّا ﴿٥٩﴾ ﴾ مریم. واتە: (لە دوای ئەوان، کەسانێك لە نەوەکانیان بوونە جێنشین، کە نوێژەکانیان بە زایە نەداو شوێن ئارەزووەکانیان دەکەوتن، ئەوانە تووشی گومڕایی و سەرگەردانی و سزا دەبن لە ژیانی دونیاو دوارۆژیشدا).

❖ لە تەفسیری (ابن کثیر) دا هاتووە، کە وشەی (غیاً) شیوێکە لە دۆزەخ. زۆر قووڵ و ناخۆش و پیسە، شاخەکان ناتوانن لە ناویدا خۆیان ڕاگرن و دەتوێنەوە، ئایا ئەتوانی دانیشتووانی ئەو شوێنە بێنیتە بەرچاوت، کە بە چ شێوەیەك سزا دەدرێن؟!

❖عبدالله ی کوڕی مەسعود ﷺ و کەسانی تریش فەرموویانە: مانای (أضاعوا) ئەوە نیە کە بە تەواوی وازیان لە نوێژەکانیان هێنابێت، بەڵکوو تەنیا نوێژەکانیان دوا دەخەن و لە کاتی خۆیدا جێبەجێی ناکەن..

❖سەعیدی کوڕی مسەییەب (ڕەحمەتی خودای لێبێت) دەفەرمویت: ئەوە مانای ئەوەیە کە نوێژی نیوەڕۆ ناکات هەتا نزیکی عەسر و نوێژی عەسر ناکات هەتا نزیکی ئێوارە و ڕۆژ ئاوابوون و بەو شێوەیە..

ئەم سزایە تەنیا بۆ ئەو کەسانەبوو کە ساردووسڕن لە نوێژەکانیاندا، ئەی ئەبێت حاڵی ئەو کەسانە چۆن بێت کە هەر نوێژ ناکەن؟!

بەڵام موژدە بێت بۆ ئەو کەسانەی کە دەگەڕێنەوەو تەوبە ئەکەن، خودای

گەورە بە بەهەشتیان شاد دەکات، هەروەك دەفەرمویت:﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا ﴿٦٠﴾ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّهُۥ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَأۡتِيّٗا ﴿٦١﴾﴾مريم .واتە: (جگە لەوانەی کە تەوبە ئەکەن و باوەڕ دەهێنن و کارو کردەوەی چاك ئەنجام ئەدەن ئەوانە دەچنە بەهەشت و بە هیچ جۆرێك ستەمیان لێناکرێت• ئەو بەهەشتە چڕانەی کە خودای میهرەبان بەڵێنی بە بەندەکانی داوە، بەڕاستی ئەو بەڵێنەی خودای گەورە بەڕێوەیەو هەر دێتەدی)..

❖ دەی ئەتوانی بەراوردێك بکەیت لە نێوان، ئەو کەسانەی کە گەڕانەوە بۆلای خوداو وازیان لە سەرپێچی هێنا، لەگەڵ ئەوکەسانەی کە بەردەوام بوون لەسەر نوێژ نەکردن و بێ فەرمانی خودا؟!

❖بیهێنە بەر چاوت، کاتێك دانیشتوانی بەهەشت پرسیار لە دۆزەخیەکان دەکەن و پێیان دەڵێن: چی وای لە ئێوە کرد، کە بچنە دۆزەخەوە؟

ئەوانیش وەڵام ئەدەنەوەو دەڵێن: لەبەر ئەوەی ئێمە نوێژمان ئەنجام نە ئەداو لە نوێژ خوێنان نەبووین، هەروەك خودای گەورە دەفەرمویت:﴿ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلۡيَمِينِ ﴿٣٩﴾ فِي جَنَّٰتٖ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمۡ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُواْ لَمۡ نَكُ مِنَ ٱلۡمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمۡ نَكُ نُطۡعِمُ ٱلۡمِسۡكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلۡخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾﴾المدثر. واتە: (لە ڕۆژی دوایی دا هەموو کەس بارمتەی دەستپێشکەری خۆیەتی و کردەوەکانی دێنەوە ڕێی، جگە لە دەستەی ڕاستان و ئیماندارانی خاوەن کردەوەی چاك،کە لە ناو بەهەشتەکاندا پرسیار دەکەن لە بارەی تاوانبارانەوە، ئەوە چی بوو ئێوەی ڕاپێچی دۆزەخ کرد؟! بە کەساسیەوە دەڵێن: ئێمە لە نوێژ خوێنان نەبووین.. هەروەها خواردنمان نە دەبەخشی بە هەژاران.. هەروەها ئێمە لەگەڵ دەم درێژو بێ ئابرووەکاندا قسەی خۆمان دەکردو وەکو ئەوانمان ئەووت و ڕەخنەی بێجێمان ئەگرت و لەگەڵیان ڕۆچووین لە تاوان و گوناهدا.. بڕوامان بە ڕۆژی پاداشت و سزا نەبوو..هەتا مردن هات و یەخەی پێ گرتین و ڕۆژگاری تەمەنمان کۆتایی هات)..

بەڵێ.. تەوبەیان نەکردو نەگەڕانەوە بۆلای خودا، هەتاوەکو مردن هات و

یەخـەی پێگرتـن..﴿ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلۡيَقِينُ ﴿٤٧﴾ ﴾المدثر. بەڵـێ.. تـا ئـەو کاتـەی مردن یەخـەی پێگرتـن، ئەمـان هـەر لەسـەر حاڵی خۆیـان بـەردەوام بـوون..﴿ فَمَا تَنفَعُهُمۡ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ ﴿٤٨﴾ ﴾المدثر. واتە:(تازە شـەفاعەت و تکای تـکاکاران هیچ سوودێکی نیە بۆیان)..

بەڕاسـتی کۆمەڵێکی زۆر چارە ڕەش و بەد بەخت بوون، بەڕاستی خەجاڵەتی ژیانـی دونیـاو دواڕۆژ بوون.. کەسـانێك بـوون ژیانیـان لە گومڕایـی و دوور لە هیدایەتـدا بردە سـەر، مل کەچی خـودای پەروەردگار نەبوون، لـە ڕۆژی دوایدا خودای گەورە ڕوویان لێوەر دەگێڕێ و فریشـتە دڵڕەق و بێ بەزەییەکانی دۆزەخ لەسەر دەم و چاویان ڕایان دەکێشـن بۆ ناو دۆزەخ..﴿ إِنَّ ٱلۡمُجۡرِمِينَ فِي ضَلَٰلٖ وَسُعُرٖ ﴿٤٧﴾ يَوۡمَ يُسۡحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ ﴾القمر. واتـە: (بەڕاسـتی تاوانباران لە گومڕایی و شێتیەکی زۆردا ڕۆچوون* ڕۆژێك دێت کە لەسەر ڕوو ڕا دەکێشـرێن لەناو ئاگری دۆزەخداو پێیان دەوترێت: دە بچێژن تاڵاوو ناڕەحەتی دۆزەخ)..

بیر لـەم ئایەتە پیرۆزەی خـودای گەورە بکەرەوە کـە دەفەرموێت:﴿ إِنَّهُۥ مَن يَأۡتِ رَبَّهُۥ مُجۡرِمٗا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحۡيَىٰ ﴿٧٤﴾ وَمَن يَأۡتِهِۦ مُؤۡمِنٗا قَدۡ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلۡعُلَىٰ ﴿٧٥﴾ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ﴿٧٦﴾ ﴾طه.واتـە: (ئێمـە دڵنیایـن کە ئـەوەی بە تـاوان و گوناهەوە بگەڕێتـەوە بـۆلای پەروەردگـاری، بێگومـان دۆزەخ بـۆی ئامادەیە و نـە تیایدا دەمرێت و نە بە ئاسـوودەیی دەژێت * ئەو کەسـەش کە بە ئیمانەوە بگەڕێتەوە بـۆلای پەروەردگـاری و بە ڕاسـتی کردەوە چاکەکانـی ئەنجام دابێـت، ئەوا پلەو پایـەی بەرزو بڵندیان بۆ ئامادەیە * دەچنە ناو بەهەشـتی (عدن) کە باخەکانی چـڕوو پڕەو چەندەهـا ڕووبار بە ژێـر درەختەکانیـدا دەڕوات، هەروەها لەگەڵ ژیانـی نەبڕاوەدا، ئەوەش پاداشـتی کەسـێکە کـە دڵ و دەروون و ڕەوشـتی خۆی خاوێن کردبێتەوە)..

# حوکمی نوێژنەکەر

پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (إنَ بَينَ الرَجُلِ وَبَينَ الشِرك وَالكُفر،تَرك الصَلاة)[٩٠]. واتە: (بێگومان نێوانی پیاوو هاوەڵ دانان بۆ خوداو بێباوەڕی، وازهێنانە لە نوێژ).. لەبەر ئەوەی ئەنجام دانی نوێژ نیشانەیەکی دیارو بەرچاوەو بەڵگەیە لەسەر موسڵمانێتی و وازهێنانیشی بەڵگەیە لەسەر بێباوەڕی..

هەروەهـا پێغەمبەری خودا ﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: (العَهدُ الـذي بَينَنـا وَبينَهُم الصَـلاة، فَمَن تَرَكَهـا فَقد كَفَـر)[٩١]. واتە: (ئـەو پەیمانەی لە نێـوان ئێمەو ئەواندا هەیـە، بریتیە لە نوێژ، هەرکەسـێك وازی لێبهێنێت، ئەوا بەدڵنیاییەوە بێباوەڕە)..

❖ ئایا ئەزانیت حوکمی ئەو کەسـە چی یە کـە بمرێت و نوێژی نەکردبێت؟!

هەندێك لـە زانایان دەفەرموون: نوێژ نەکەر نابێت ژنـی لێمارە بکرێت و نابێت رێگـەی پێبدرێـت بچێتە شـاری مەککەوە، وە ئەگەر کەسـێکی نزیکـی بمرێت، میراتـی لێناگرێت، هەروەها ئەگـەر مرد نابێت بشـۆرێت و نابێت کفن بکرێت و ناشـبێت لە گۆڕسـتانی موسـوڵمانان بنێژرێت.. ئـەی چی لێ بکرێـت؟! دەبێت ببرێتە چۆڵەوانی و بە جل وبەرگی خۆیەوە بنێژرێت..

❖ حەز دەکەم پرسـیارێکت لێ بکەم، هەرچەندە لەوانەیە نارەحەتت بکات، ئایا تۆ حەز دەکەیت لە رۆژی دوایدا لەگەڵ کێدا حەشر بکرێیت؟!

بـەم فەرموودەیـەی پێغەمبـەری خـودا ﷺ وەڵامـت دەدەینـەوە کـە لـە بـارەی نوێـژەوە فەرموویەتی: (مَن حافَـظَ عَلَيها كانَت لَـهُ نُوراً وَبُرهَانـاً وَنَجاةً يَـومَ القِيامَة،وَمَـن لَم يُحافظ عَلَيها،لَم يَكُـن لَهُ نُورَ وَلا بُرهانَ وَلانَجـاة، وَكانَ يَومَ القِيامَـةِ مَعَ قـارون وَفرعَون وَهامانَ وَأُبَي بن خَلَف)[٩٢]. واتە: (هەر کەسـێك ئاگای لـە نوێژەکانی بێت و نەیان فەوتێنێ، خودای گەورە لـە رۆژی دواییدا رووناکی و

---

٩٠-رواه مسلم.

٩١- رواه الترمذي.

٩٢ رواه احمد والطبراني وابن حبان.

بەلگەی سەرفرازی پێدەبەخشێت،وە هەرکەسێك پارێزگاری لە نوێژەکانی نەکات، لە ڕۆژی دواییدا بەبێ ڕووناکیو بەلگەی سەرفرازی دەمێنێتەوەو لەگەڵ قارونو فیرعەونو هامانو ئوبەی کوڕی خەلەف دا حەشر دەکرێت)!

❖ هەرکەسێك دەوڵەمەندییەکەی سەرقاڵی کردبێتو لە نوێژەکانی دووری خستبێتەوەئەوا لەگەڵ قارون دا حەشر دەکرێت..

❖هەرکەسێك موڵكو ماڵەکەی سەرقاڵی کردبێت، ئەوا لەگەڵ فیرعەون دا حەشر دەکرێت..

❖هەرکەسێك کار بەدەستیەکەی سەرقاڵی کردبێت، ئەوا لەگەڵ هامان دا حەشر دەکرێت..

❖هەرکەسێك بازرگانی یەکەی سەرقاڵو خەریکی کردبێت، ئەوا لەگەڵ ئوبەی کوڕی خەلەف دا حەشر دەکرێت. پەنا بەخودا..

ئەو کەسانەی باسمان کردن سەرانی کوفرو بێباوەڕیو دووڕوویین.. ئایا حەز دەکەیت لەگەڵ ئەو کەسانەدا حەشر بکرێیت؟! بڕواناکەم حەز بکەیت!!

❋ براو خوشکی ئازیزم: باش بزانە هەرکەسێك گوێ بە نوێژەکانی نەدات، ئەوا گوێ نەدان بە کارەکانی تر زۆر لەلای ئاسان دەبێت..

❖ ئیمامی ئەبوبەکرو ئیمامی عومەر (خوایان لێ ڕازی بێت) دەفەرموون: (هەرکەسێك واز لە نوێژەکانی بێنێت، بێبەش دەبێت لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام).

ئەی ئەو کەسەی ژیانی دونیا نوێژی لەبیرت بردۆتەوەو لە خۆشی نوێژ بێبەش بوویت...

تو خوا پێم بڵێ: چۆن دەروونت ئاسوودە دەبێتو دڵت ئارام نەگرێت، کاتێك نوێژەکانت ئەنجام نادەیت؟! چۆن دەتوانیت سەر بخەیتە سەر سەرین، بە بێ ئەوەی نوێژی عیشات ئەنجام دابێت؟! ئایا ناترسیت ئەمە خەوی یەکجاریت بێتو ئیتر خەبەرت نەبێتەوە؟! ئایا هەست بە هێزو دەسەڵاتو توانای خودا ناکەیت؟! ئایا لە سزای خودای باڵادەست ناترسیت؟! ئایا سپی بوونی سەرت ڕای نەچڵەکاندویت؟! هێشتا گومانت ماوە؟ نزیکە مردن ڕێگەت پێ بگرێتو بۆ هەتا هەتایی ئەم ژیانی دونیایە بەجێ بێڵیت..

**شەرابە ناکامی مردن پێی ئەگەی نۆشی ئەکەی**
**خاك بەسەر خۆڵت بە دامان بۆ فەرامۆشی ئەکەی**

❋ براو خوشـکەکانـم: ئەی ئەو کەسـانەی لە ئاگری دۆزەخ دەترسـن، پەلە بکـەن!! پەلە بکەن!! بەڵێ.. پەلـە بکەن و بگەڕێنەوە بۆلای خـودا، بۆ ئەوەی لە گوناهەکانتان خۆش بێت و لێتان ببورێت، ئەوەتا خودای گەورە بانگمان دەکات و دەفەرمویـت: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا۟ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾﴾ الزمر. واتـە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: خودای گەورە دەفەرموێت: ئەی بەندەکانم ئەوانەتان کەخۆتان گوناهبـار کـردووەو هەڵەتان زۆرە، نا ئومێدو بێ هیـوا مەبن لە ڕەحم و بەزەیی خـودا، چونکە بەڕاسـتی ئەگەر نیوە، تەوبەی ڕاسـت و درووسـت بکەن، خودا لە هەمـوو گوناهـو هەڵەکانتان خـۆش دەبێت، چونکـە بێگومان ئـەو خودایە زۆر لێخۆشـبوو و لێبوردەیەو زۆریش بە سـۆزو میهرەبانە ● هەوڵ بدەن هەمیشەو بەردەوام دڵتان لـەلای خودابێت و بگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگارتان و تەسـلیمی ئەوبن، پێش ئەوەی کە سزای خودا یەخەتان پێ بگرێت، لەوەو دواش سەرکەوتوو نابن و کەس نابێت بەرگریتان لێ بکات)..

❖ مامۆسـتایەکی بانگخـواز دەفەرموێـت: لە هۆڵی ڕۆیشـتنی فڕۆکەخانەدا چاوەڕێی دەسـت پێکردنی گەشتەکەمم دەکرد بۆ ئەوەی بچم بۆ یەکێك لە وڵاتە بیانیەکان بە مەبەسـتی بانگـەواز کردن بۆ دینی خـودا.. تێبینی ئەوەم کرد کە زۆرێك لە گەنجان گەشـت دەکەن بۆ ئەو وڵاتە بە مەبەستی ئەنجامدانی گوناهـو تـاوان.. لەپڕ دوو گەنجم بینی تەمەنیان هەر بیسـت سـاڵێك دەبوو، لە شـێوازو ڕوخساریشـیاندا ئەوە دەردەکەوت کە مەبەستی گەشتەکەیان بۆ ئەو وڵاتە تەنها بۆ ئەنجامدانی گوناهـو تاوان بێت..

لە دڵی خۆمدا وتم: پێویستە بچم بۆ لایان و ڕزگاریان بکەم، پێش ئەوەی کار لە کار بترازێت، بەڵام شەیتان پێی دەوتم: حەقت چیە بە سەریانەوە، وازیان لێبێنە بۆ کوێ دەچـن با بچن، چونکە ئەوانە بە دەنگتەوە نایەن و گوێت لێناگرن.. هەر

چۆنێك بێت چووم بۆ لایان و سلاوم لێکردن، پاشان کۆمەڵێك ئامۆژگاریم کردن و پێم وتن: چی دەکەن ئەگەر لە ئاسماندا کەموکورپەك لە فڕۆکەکەدا دروست بێت؟! بەو نیەتەی کە لە دڵتاندایە لە ڕۆژی دواییدا لە ڕووتان دێت بەرامبەر خودای پەروەردگار ڕابوەستن؟! هەر دووکیان دەستیان کرد بە گریان و یەکسەر بلیتی گەشتەکەیان دڕاند و وتیان: ئێمە درۆمان لەگەڵ کەس وکارماندا کردووەو پێمان وتوون دەچین بۆ مەککە، ئێستا چیان پێ بڵێین؟! مامۆستاکە وتی: لەگەڵ ئەم هاوەڵەمدا بڕۆن کارەکانتان بۆ ڕێکدەخات..

دوو گەنجەکە لەگەڵیدا کەوتنە ڕێ و هاوەڵەکەی مامۆستاش پێی وتن: هەفتەیەك لە لام بمێننەوەو پاشان بۆ لای کەس وکارتان بگەڕێنەوە.. لە یەکێك لە شەوەکاندا لە ماڵی هاوڕێکەی مامۆستا بانگخوازێك کۆمەڵێك ئامۆژگاری زۆر کاریگەری پێشکەش کردن.. دوو گەنجەکە بڕیاریاندا سبەی دوای نوێژی بەیانی بۆ ئەنجامدانی عومرە بەرەو مەککە بکەونە ڕێ.. ئیحرامیان بەست و کەوتنە ڕێ، بەڵام لە ڕێگەداو پێش ئەوەی بگەنە شاری مەککە توشی ڕوداوی ئوتومبیل بوون و گۆشت و خوێنیان لەگەڵ جامی ئوتومبیلەکەدا تێکەڵ بوو.. لە دواین ساتەکانی تەمەنیاندا سرودی (لبيك اللهم لبيك، لبيك لاشريك لك لبيك....)یان دەوتەوە.. ماوەی نێوان مردن و دڕاندنی بلیتی گەشتەکەیان چەندە نزیك بوو؟! خودای گەورە هیدایەتی پێبەخشین و لە دوا ڕۆژێکی ڕەشەوە بەرەو دواڕۆژێکی ڕوناك و پرشنگداری بردن[٩٣]..

❖ یەکێك لە سەرکردەکانی عەرەب لە وڵاتی بۆسنەو هەرسکەوە، ئەم هەڵوێستەمان بۆ باس دەکات و دەڵێت: هەندێك لە برایانمان گەنجێکی بۆسنەییان هێنا، کە ئەو گەنجە بە ناوبانگ بوو بە عارەق خۆری و داوێن پیسی.. داوایان لێ کردم کە بەشداری بکات لە ڕاهێنان و مەشقەکاندا (تدريب)، منیش ڕەزامەندیم دەرنەبڕی، لەبەر ئەوەی ترسام کار بکاتە سەر ڕەوشتی گەنجەکانی ترو خراپیان بکات.. زۆر هەوڵیان دا، تاوەکو منیش ڕازی بووم، بەڵام بەردەوام چاودێریم دەکرد..

---

٩٣-عندما بكى/ فهد عبدالرحمن الحميد.

ڕۆژێکیان لە دیمەنێکی سەیرو ناوازەدا بینیم، کە هەرگیز چاوەڕوانی ئەو حاڵەتەم لێ نە دەکردا! ئەزانن لە چ دیمەنێکدا بینیم؟! ئەو گەنجەم بینی لە سوننەتی پێش نوێژی بەیانیداو فرمێسك بە هەردوو چاویدا دەهاتە خوارەوە، وەك ئەوەی بڵێت: ئەی خودایە، ئەوا من گەڕامەوە بۆلای تۆو تەوبەم کرد، دەی تۆش بمبەخشەو تەوبەکەم لێ وەرگرە[٩٤]...

با هیچ کەسێکیش نەڵێت: خودای گەورە ڕێگەی هیدایەتی نیشان نەداوم.. ئەگەر وابڵێت، ئەوا ئێمەش دەڵێین: ئەگەر بتەوێت هیدایەت و ڕێگەی ڕاست بدۆزیتەوە زۆر ئاسانە، هەروەك خودای گەورە لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت: (يا عبادي كُلُّكُم ضالٌ إلاّ مَن هَدَيتُهُ، فَاستَهدُوني أَهدِكُم)[٩٥]. واتە: (ئەی بەندەکانم، ئێوە هەمووتان ڕێگەتان وون کردووە، مەگەر کەسێك کە خۆم هیدایەتی بدەم، داوای هیدایەتم لێ بکەن، هیدایەتتان ئەدەم)..

دەی پەلە بکەو بگەڕێوە بۆلای خودای پەروەردگارت، چونکە نازانی کەی و لە کوێ دەمریت..

لیت شعري فإنني لستُ أدري! أي يوم يكون آخر عمري؟
وبأي البلاد تُقبضُ روحي؟ وبأي البلاد يحفرُ قبري؟

خۆزگە بم زانیایە، بەڵام نەم زانی!
چ ڕۆژێك کۆتا ڕۆژی تەمەنمە ؟
لە چ شارو وولاتێك ڕۆحم دەکێشرێت؟
لە چ شارو ناوچەیەك گۆڕم بۆ هەڵئەکەنرێت؟

❋ براو خوشکی بەڕێزم: ئەگەر ئەتەوێت بگەڕێیتەوە بۆلای خودای پەروەردگارو تەوبە بکەیت، ئەوا پێویستە لەسەر نوێژەکانت بەردەوام بیت و ڕێگەی قورئان خوێندن و نزاو پاڕانەوە بگریتە بەر، هەروەها پێویستە هاوڕێی چاکەکاران بیت و لە کەسانی خراپ دوورکەویتەوە، ئەوەشی کە زۆر گرنگە، واز

---

٩٤-ياليت قومي يعلمون.

٩٥-رواه مسلم.

هێنانە لە تاوان و گوناهو سەرپێچی خودای گەورە..

❋ ئیمامی بوخاری دەفەرموێت: لەو کاتەوەی کە باڵغ بووم، هەرگیز غەیبەتی هیچ موسڵمانێکم نەکردووە.. هەروەها ئیمامی شافیعی دەفەرموێت: هەرگیز نە بە ڕاست و نە بە درۆ سوێندم بە خودا نەخواردووە.. مەسروق لەکاتی ئەنجامدانی فەریزەی حەجدا بەردەوام خەریکی خوداپەرستی و عیبادەت بوو، مەگەر لە سەجدەدا خەوی لێبکەوتایە، ئەگەر نا نەدەخەوت.. ئەبو سلێمانی دارانی دەفەرموێت: هەموو ڕۆژێك سەیری ئاوێنە دەکەم، بۆ ئەوەی بزانم ڕوخسارم بە هۆی گوناهەوە ڕەش داگەڕاوە یان نا؟! ئەوە حاڵی ئەو پیاو چاکانەیە!! ئەی دەبێت حاڵی من و تۆ چۆن بێت؟! خۆمان هەستی پێناکەین، دەبێت ئێستا ڕوخسار و شێوەمان چی بە سەر هاتبێت[٩٦]؟!

❋ پیاوێك دەچێت بۆلای (شێخ حەسەنی بەصری) و پێی دەڵێت: شەوان بۆ شەو نوێژ خەبەرم نابێتەوە، بۆ نوێژی بەیانی هەڵدەستم و بە جەماعەت ئەنجامی ئەدەم، بەڵام ناتوانم بۆ شەو نوێژ هەستم..

(شێخ حەسەنی بەصری)ش پێی دەفەرموێت: (قَیَّدَتکُم ذُنُوبکُم). واتە: (گوناهـ و تاوانەکانتان کۆت و بەندیان کردوون، یاخود ـ کەلەپچە یان کردوون ـ)..

❋ سوفیانی سەوری بەهۆی تەنها گوناهێکەوە پێنج مانگ لە ئەنجامدانی شەونوێژ بێبەش بوو.. با دڵنیابین هەموومان تاوان و گوناهمان هەیە (نەزەر ـ غەیبەت ـ خواردنی حەرام ـ ڕق و کینە ـ حەسوودی ـ سەیر کردنی فلیمی خراپ ـ گوێ گرتن لە قسەی پڕوپوچ و گۆرانی... هتد) دەی با هەوڵبدەین وازیان لێ بێنین بە پشت بەستن بە خودای پەروەردگار..

لێرەدا حەز دەکەم ئەم فەرموودە پیرۆزەی پێغەمبەری نازدارتان ﷺ بیر بێنمەوە کە دەفەرموێت: (إغتَنِم خَمسَاً قَبلَ خَمس: شَبابَكَ قَبلَ هَرَمِك، وَصَحَتَكَ قَبلَ سَقَمِك، وَغِناكَ قَبلَ فَقرِك، وَفَراغَكَ قَبلَ شُغلِك، وَحَياتَكَ قَبلَ مَوتِك)[٩٧]. واتە: (سوودو کەڵك وەرگرە لەم پێنج شتە، پێش ئەوەی ئەم پێنج شتە ڕوو بدەن:

---

٩٦- حدائق ذات بهجة.

٩٧- رواه الحاكم.

١- تەمەنی لاویت، پێش ئەوەی پیر بیت..

٢- لەش ساغیت، پێش ئەوەی نەخۆش کەویت..

٣- دەوڵەمەندیت، پێش ئەوەی هەژار بیت..

٤- کاتە بەتاڵەکانت، پێش ئەوەی سەرقاڵ و مەشغوڵ بیت..

٥- ژیانت، پێش ئەوەی بمریت..

## کاری ئاسان و پاداشتی گەورە

هەمووومان ڕۆژانە زۆر کاری ئاسان و پاداشتی گەورە لە دەست دەدەین.. زۆر هەڵپەی پەیداکردن و کۆکردنەوەی ماڵ و سامان دەکەین و خەریکە بە تەواوی لە دواڕۆژمان بێئاگا دەبین..

❖ پیاوێک دەچێت بۆ لای پیاوچاکێک و سکاڵای گرانی بازاڕی لەلا دەکات، پیاوچاکەکەش دەفەرموێت: ئەگەر دەنکێک گەنم ببێت بە دینارێک (واتە دینارێکی زێڕ) خەمم نیە، چونکە ئەوەی لە سەر منە ئەوەیە کە خودای پەروەردگار بپەرستم بەو شێوەیەی کە فەرمانی پێکردووم، ئەوەشی کە لە سەر خودایە ئەوەیە کە ڕزق و ڕۆزیم پێببەخشێت، هەروەك پەیمانی پێداوم.. ﴿وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَوٰةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا نَّحْنُ نَرْزُقُكَ وَالْعَـٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ﴿١٣٢﴾﴾ طه. واتە: (ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەی ئیماندار فەرمان بدە بە هەر هەموو تاکەکانی خێزانت، تا نوێژەکەیان (بە چاکی ئەنجام بدەن، چونکە نوێژ خۆراکی ڕۆحە) و بەردەوام و خۆڕاگربە لە سەری، ئێمە بێگومان داوای ڕزق و ڕۆزی لە تۆ ناکەین، بەڵکو ئێمە ڕزق و ڕۆزی بە تۆ دەبەخشین، سەرەنجامی چاکیش هەر بۆ خواناسی و دینداریە)..

❖ مامۆستایەك دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ڕۆژێك لە ئوتومبیلەکەمدا لەگەڵ هاوڕێیەکمدا بووم، ئەو هاوڕێیەم کەسێکی زۆر ئیماندار بوو، خودای گەورەش بەندەکانی خۆی باشتر دەناسێت.. هاوڕێکەم پرسیارێکی سەیری لێکردم و وتی: نەخۆشێك ناناسیت؟ وتم: تێناگەم مەبەستت چیە؟! وتی: دەمەوێت سەردانی نەخۆشێك بکەم.. وتم: بۆچی؟! وتی: سوپاس بۆ خودا ئەمڕۆ بەڕۆژووم،

هەروەهـا ئامادەی ناشـتنی جەنازەیەکیش بووم، ئێسـتاش دەمەوێت سـەردانی نەخۆشێك بکەم..

❖ڕۆژێـك پێغەمبـەری خـودا ﷺ لـە هاوەڵەکانی دەپرسـێت: کـێ ئەمڕۆ بـەڕۆژووە؟ ئیمامـی ئەبوبەکـر ﷺ فەرمـووی: مـن.. پێغەمبـەری خودا ﷺ فەرمـووی: کـێ ئەمڕۆ لەگـەڵ جەنازەیەکـدا چووە بۆ سـەر قەبـران؟ ئیمامی ئەبوبەکـر ﷺ فەرمـووی: من.. پێغەمبـەری خودا ﷺ فەرمـووی: کێ ئەمڕۆ هەژارێکی تێر کردووە؟ ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ فەرمووی: من.. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: کێ ئەمڕۆ سەردانی نەخۆشێکی کردووە؟ ئیمامی ئەبوبەکر ﷺ فەرمووی: مـن.. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەم کارانە لە هەر کەسـێکدا هەبێت بەهەشتیە..

❖ یەکێك لە ڕێگە هەرە ئاسـانەکانی دەستکەوتنی پاداشت، بریتیە لە زیکر و یـادی خـودای پەروەردگـار.. خودای گـەورە دەفەرموێـت: ﴿ فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ ﴾ واتـە: (ئەی ئیمانـداران ئەگەر یادی مـن بکەن، منیش یـادی ئێوە دەکـەم).. یادی پەروەردگـار پێویسـتی بە دەسـت نوێـژ و ڕووکردنە قیبلـە نیە، بـە پێوە بیت یـان بە دانیشـتنەوە، یاخود بە ڕاکشـانەوە بیـت، دەتوانیت ئەنجامـی بدەیت.. هـەروەك خـودای پەروەردگـار دەفەرموێـت: ﴿ ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ رَبَّنَا مَا خَلَقۡتَ هَٰذَا بَٰطِلٗا سُبۡحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ١٩١ ﴾ آل عمـران. واتـە: (ئەوانەی یـادی خودا دەکەن لە کاتێکدا کە بە پێوەن یان دانیشـتوون یان ڕاکشـاون (لە هیچ حاڵەتێکدا یادی ئەو زاتە فەرامۆش ناکەن)، هەمیشـە بیر دەکەنەوە لە دروسـت بوونی ئاسمانەکان و زەوی (بیر دەکەنەوە لە هەموو وردەکاریەك، سەرنجی هەموو دیاردەیەك دەدەن، سـەرئەنجام دەڵێن): پەروەردگارا تۆ ئەم هەموو دروسـت کراوانەت بێهودەو بێ ئامانج دروسـت نەکردووە، پاکی و بێگەردی شایستەی تۆیە، دە تۆش بمانپارێزە لـە سـزای ئاگـری دۆزەخ) .. پێغەمبەری خـوداش ﷺ دەفەرموێـت: (مثل الذی یذکـر ربه والذي لایذکر ربـه مثل الحي والمیـت)[98]. واتە: (نمونەی ئەو کەسـەی

---

٩٨-رواه البخاري ٦٤٠٧.

کـە یـادی خـودای پەروەردگـار دەکات، لەگەڵ ئەو کەسـەی کـە یادی نـاکات، وەکو نمونـەی زیندوو و مـردوو وان).. هەروەهـا دەفەرمویت: (ئایـا ئاگادارتان بکەم بە باشـترین کردارەکانتان، وە پاکترین و چاکترین و بەرزترین کردار لە لای خودای پەروەردگار، وە باشتر بێت بۆتان لە بەخشینی زێڕ و پارە، وە لەوەش چاکتر بێت کە بـە دوژمنەکانتان بگەن و لە گەردنیان بـدەن و ئەوانیش لە گەردنتان بدەن؟ وتیـان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خـودا .. پێغەمبەری خـودا ﷺ فەرموی: زیکر و یـادی پەروەردگـار).. یـادی پەروەردگار هۆکارێکـی گەورەیە بـۆ نەمانی غەم و دڵتەنگی، هۆکارێکیشـە بۆ دڵنیایی و ئارامی.. خـودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾﴾ الرعد. واتە: (ئاگاداربن دڵەکان هەر بە قورئان و یادی پەروەردگار ئارام دەبن و دەحەوێنەوە)..

❖ یەکێك لەو زیکرانەش وتنی (أستغفر الله)یە، پێغەمبەری خودا ﷺ هەموو ڕۆژێك سـەد جار (أسـتغفر الله)ی کردووە.. خودای پەروەردگاریش دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾﴾ الأنفال. واتـە: (هەروەهـا خودا سزادەر نیە لە کاتێکدا ئەوان داوای لێخۆشبوون بکەن)..

❖ پیاوێـك هات بۆ لای (حەسـەنی بەصری) و پێـی وت: بێبارانیە و بارانمان بۆ ناباریت، چی بکەین باشـە؟ حەسـەنی بەصری فەرمووی: زۆر (أسـتغفر الله) بکەن.. کەسـێکی تر هات و سـکاڵای نەبوونی و هەژاری دەکرد، حەسەنی بەصری فەرمووی: زۆر (أسـتغفر الله) بکە.. کەسـێکی تر هات و وتی: خێزانەکەم منداڵی نابێت، حەسەنی بەصری فەرمووی: (أستغفر الله) بکەن.. کەسێکی تر هات و وتی: دانەوێڵە دەچێنین و بەرهەممان نیە، حەسەنی بەصری فەرمووی: (أستغفر الله) بکەن.. ئەوانەی ئامادەی دانیشتنەکە بوون وتیان: بۆچی بۆ هەموویان هەر وتت (أسـتغفر الله) بکەن؟! حەسـەنی بەصریش لـە وەڵامدا فەرمـووی: ئەی خودای گەورە نافەرمویت: ﴿فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَارًا ﴿١٢﴾﴾ نـوح. واتـە: (بەردەوام پێم دەوتن: ئێوە داوای لێخۆشـبوون لە پەروەردگارتان بکەن، چونکە بە ڕاسـتی ئەو زاتێکی لێخۆشـبووە ❋ بارانتان بە لێزمە و خـوڕەم بۆ دەبارێنێت

●ماڵو سامانو نەوەتان پێدەبەخشێت، هاوڕێ لەگەڵ باخو باخاتدا، ڕوبارو چەمو جۆگەتان بۆ بەدی دەهێنێت)[٩٩]..

❖ پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (الساعي على الأرملة والمسكين كالمجاهد في سبيل الله)[١٠٠]. واتە: (ئەو کەسەی کە یارمەتی بێوەژنو هەژار دەدات، وەکو ئەو کەسە وایە کە لە ڕێگەی خوادا تێدەکۆشێت)..

❖ پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (والذي نفسي بيده لاتدخلوا الجنة حتى تؤمنوا، ولاتؤمنوا حتى تحابوا، أَوَلا أدلكم على شيء إذا فعلتموه تحاببتم؟ أفشوا السلام بينكم)[١٠١]. واتە: (سوێند بەوەی گیانی منی بە دەستە ناچنە بەهەشت هەتا باوەڕ نەهێنن، باوەڕیش ناهێنن هەتا یەکترتان خۆش نەوێت، ئایا ڕێتان پیشاندەم بۆ شتێك کە ئەگەر ئەنجامی بدەن، یەکترتان خۆش بوێت؟ سلاو لە یەکتری بکەن)..

❖ پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (من صلّى عليَّ صلاة، صلى الله عليه بها عشراً)[١٠٢]. واتە: (هەر کەسێك سەلاواتێکم لە سەر بدات، ئەوا خودای گەورە دە سەلاواتی لە سەر دەدات)..

❖ پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (مامن عبدٍ يصوم يوماً في سبيل الله إلا باعد الله بذلك اليوم وجهه عن النار سبعين خريفاً)[١٠٣]. واتە: (هەر بەندەیەك لە ڕێی خوادا ڕۆژێك بەڕۆژوو بێت ئەوا بەو ڕۆژە خودای گەورە ڕوخساری ئەو کەسە حەفتا پایز لە ئاگری دۆزەخ دوور دەخاتەوە)..

❖ پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (هەر کەسێك لە ڕۆژێکدا سەد جار بڵێت: (لاإله إلا الله وحده لاشريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير) خێری ئازاد کردنی دە بەندەی هەیە، سەد چاکەشی بۆ دەنوسرێت، وە سەد

---

٩٩-عندما بكى.

١٠٠-متفق عليه.

١٠١-رواه مسلم.

١٠٢-رواه مسلم.

١٠٣-متفق عليه.

خراپەی لێدەسڕێتەوە، وە ئەو ڕۆژە هەتا ئێوارە لە شەیتان دەپارێزرێت، هیچ کەسێکیش لەو باشتر نیە، تەنها کەسێك نەبێت کە لەم زیاتر ئەم زیکرەی کرد بێت)..

❖ پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (من قال سبحان الله وبحمده في يوم مائة مرة حطت خطاياه وإن كانت مثل زبد البحر)[١٠٤]. واتە: (هەر کەسێك لە ڕۆژێکدا سەد جار بڵێ: (سبحان الله وبحمده) ئەوا گوناهەکانی دەسڕێنەوە، ئەگەر گوناهەکانی هاوشێوەی کەفی دەریاش بێت)..

❖ پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (أفضل الصيام بعد رمضان شهر الله المحرم، وأفضل الصلاة بعد الفريضة صلاة الليل)[١٠٥]. واتە: (باشترین ڕۆژوو لە دوای ڕۆژووی ڕەمەزان، ڕۆژووی مانگی موحەرەمە، وە باشترین نوێژ لە دوای نوێژە فەرزەکان، شەونوێژە)..

❖ پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (من صام رمضان ثم أتبعه ستاً من شوال كان كصيام الدهر)[١٠٦]. واتە: (هەر کەسێك ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێت، پاشان شەش ڕۆژ لە مانگی شەوال بگرێت، وەك ئەوە وایە کە هەموو ساڵەکە بەڕۆژوو بووبێت)..

❖ پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: (العمرة إلى العمرة كفارة لما بينهما، والحج المبرور ليس له جزاء إلا الجنة)[١٠٧]. واتە: (ماوەی نێوان عومرەیەك تا عومرەیەکی تر، کەفارەتی نێوانیانە، وە حەجی وەرگیراو و قبوڵکراو هیچ پاداشتێکی نیە، بەهەشت نەبێت).. هەروەها دەفەرموێت: (عمرة في رمضان تعدل حجة، أو حجة معي)[١٠٨]. واتە: (عومرەیەك لە ڕەمەزاندا بەرامبەر بە حەجێکە، یان وەکو ئەوە وایە لەگەڵ مندا حەجێکی کرد بێت)..

---

١٠٤-البخاري٦٤٠٥ ومسلم٢٦٩١.

١٠٥-رواه مسلم.

١٠٦-رواه مسلم.

١٠٧-متفق عليه.

١٠٨-متفق عليه.

لە کۆتاییـدا: داواکارم خودای پەروەردگار هیدایەتمـان، بدات بە هیدایەتی ئیمان و لە گوناهو تاوانەکانمان خۆش بێت و لاشەمان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزێت و لە بەهەشتی نەبڕاوەی خۆیدا کۆمان کاتەوە ـ ئامین ـ

سبحانك اللهم وبحمدك،

أشهد أن لا إله الاّ أنت أستغفرك وأتوب إليك.

هێمن محەمەد عەلی

سلێمانی

١٤/ ٨/ ٢٠٠٨

# سەرچاوەکان

١- تەفسیری ئاسان/ مامۆستا بورهان محمد أمین.
٢- أین نحن من هؤلاء/ د. عبدالملك القاسم.
٣- فقـه الـدلیـل/ د. عـائض الـقــرني.
٤- المسك والعنبر في خطب المنبر/ د. عائض القرني.
٥- حدائق ذات بهجة/ د. عائض القرني.
٦- أخلاق المسلم / علاقته بالخالق/ د. وهبة الزحیلي.
٧- یالیت قومي یعلمون/ عبد المحسن عبد الرحمن.
٨- أهل النار/ یوسف الحاج أحمد.
٩- تبت إلى الله/ یوسف الحاج أحمد.
١٠- وماخلقت الجن والإنس إلا لیعبدون/ د. محمد العریفي.
١١- في بطن الحوت/ د.محمد العریفي.
١٢- دموع المحراب/ أبو عبدالرحمن.
١٣- هل رأوا جنتي/ أبو عبدارحمن.
١٤- أنقذوني/ أبو عبدالرحمن.
١٥- دفونها وهي ساجدة/ أبو عبد الرحمن.
١٦- عندما بكى/ فهد عبدالرحمن الحمید.
١٧- إلا صلاتي/ مشعل العتیبي.
١٨- دموع الصالحین/ أبو الفداء محمد عزت محمد عارف.
١٩- مائة قصة من قصص الصالحین/ د. حامد أحمد الطاهر
٢٠- كاسێتی أنین الفجر/ نبیل العوضي.

# ناوەرۆك










# نزای سەحەر

• نالەو سۆزی خوداپەرستانی
ستەقینەیە، تێکەڵ بە سروەی
ەحەر.

• نزاو پارانەوەو سکاڵاو فرمێسکی
بەکارانە، دەنگی خشپەی هەنگاوی پڕ
ەکینەو ویقاری نوێژخوێنانی بەیانیانە،
ەردەو ماڵەکانی خودا.

• چیرۆكو نموونەی بەرزی پیاوچاکانو
الحانە، لە مەیدانی پەیوەستبوون بە
ێژو مزگەوتەوە.

• سروودی عاشقانی خوداپەرستو
ینوانی دیداری خودایە، لەکاتی پیرۆزی
ەحەردا.

• کۆرسی پڕ شکۆی ﴿وَالْمُسْتَغْفِرِينَ
لأَسْحَارِ﴾ە.

• فەزڵو گەورەیی نوێژی عیشاو بەیانیو
ەماعەتو ئامادەبوونی کۆڕی زانستو
یکری ماڵە پیرۆزەکانی خودایە.

• تیشکی پڕ نووری ڕووخساری ئەو
یماندارانەیە کە بە چرپەی (أشهد أن لا
ـ إلا الله وَ أشْهدُ أنَ محمداً رسولُ الله)
ئاواییان لەم دنیا فانییە کرد!!

نرخی (1000) دینارە